پ.د. تەها جابر عەلوانی

وەرگێڕانی: د.حەسەن محەمەد

# پێکەوە خوێندنەوەی سرووش و گەردوون

## (الوحي والكون)








له بڵاوكراوەكانی
سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی (٤٩)



**پ.د. تەها جابر عەلوانی**

- سالّی (١٣٥٤ک/١٩٣٥ز) لە عێراق لەدایکبووە.
- خاوەنی بڕوانامەی دکتۆرایە لە بواری (أصول الفقە) لە کۆلێژی شەریعە و یاسا لە زانکۆی ئەزهەر ساڵی (١٣٩٢ک/١٩٧٣ز).
- بڕوانامەی ماستەری لە کۆلێژی شەریعە و یاسا لە زانکۆی ئەزهەر لە ساڵی (١٣٨٨ک/١٩٦٨ز)بەدەستهێناوە.
- بڕوانامەی لیسانسی لە کۆلێژی شەریعە و یاسا لە زانکۆی ئەزهەر لە ساڵی(١٣٧٨ک/١٩٥٩ز) بەدەستهێناوە.
- بەشداری لە دامەزراندنی پەیمانگای جیهانی فکری ئیسلامی لە ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا ساڵی (١٤٠١ک/١٩٨١ز) کردووە، پاشان بووەتە سەرۆکی پەیمانگەکە بۆ ماوەی ١٠ ساڵ (١٩٨٦-١٩٩٦).
- سەرۆکی زانکۆی (القرطبة) بووە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ساڵی (١٩٩٦ز) تا ساڵی (٢٠١٤)
- ئەندامی کۆڕبەندی فیقهی نێودەوڵەتی بووە لە (جدە) و سەرۆکی ئەنجومەنی فیقهیی بووە لە ئەمریکای ژورو.

.....................................................................

**وەرگێڕ:**

**د. حەسەن محەمەد ئیبراهیم.**

- لەدایکبووی ساڵی: ١٩٧٧.
- دکتۆرا لە زانستە ئیسلامییەکان ـ پسپۆڕی لە بنەماکانی فقهـ و مەبەستەکانی شەریعەت.
- مامۆستا لە کۆلیجی زانستە ئیسلامیەکان/ زانکۆی سەلاحەدین.
- خاوەنی دوو کتێبی چاپکراو و چەندین توێژینەوەی زانستییە.

پێکەوە خوێندنەوەی سرووش و گەردوون

پ.د. تەها جابر عەلوانی



**ئەم کتێبە:**

لێکۆڵینەوەیەکی کورتە توێژەران لە هەموو تایبەتمەندییە جۆاوجۆرەکان بەئامانج دەگرێت، بۆ تێگەیشتن و بەرجەستە کردنی هەردوو خوێندنەوەکە، خوێندنەوەی سرووش (وحی) و خوێندنەوەی گەردوون (الکون) لە هەموو کایەکانی ژیاندا، بۆ ئەوەی لێهاتوانیان لە لایەنە جۆراوجۆرەکانی ئەم بابەتە بکۆڵنەوە، هەریەکەیان لە ڕووی پسپۆڕی و گرنگی پێدانی خۆیەوە ئەم بابەتە تاووتوێ بکات، بەمە ئەم بابەتە دەوڵەمەند دەبێت و وردەکارییەکانی پێدەگات، ئاسان دەبێت بۆ ئەوەی پێشکەشی توێژەران بکرێت بەوپێیەی بکرێتە دیاریکەرێکی (محدد) پەیڕەویانە کە لەداهاتودا لەدوا پێیگەیشتن و گەڵاڵەبوونی هاوکارێکی باش بێت بۆ چارەسەر کردنی زۆرێک لە ئاریشە مەعریفییە جیاوازەکانی وەک: فەلسەفەی زانستە سروشتیی و لێکۆڵینەوە ئاینیی و تەواوی زانستە مرۆڤایەتی و کۆمەڵایەتیی و هەندیک لە بابەتە فیکرییەکان.








**سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی**

سەنتەرێکی کوردستانی ناحکومی ناسیاسییە، گرنگی دەدات بە توێژینەوە و تاوتوێکردنی پرسە هزرییە بنەڕەتییەکان بۆ دووبارە هێنانەگۆی دەق و تێکستە پیرۆزەکان و چۆنیەتی دابەزاندنی چەمکە مەعریفی و بەبایەخەکانی ئیسلام لە بوارە جیاوازەکانی سەردەمدا.

**ئامانجەکانی سەنتەر:**

- بوژاندنەوەی بیرو هزر و بەکارخستنی مەعریفەی ئیسلامی لە ناوەندە زانکۆیی و پەروەردەییەکاندا، بە پشتبەستن بە بەهرە و توانا خودییەکانی ئەکادیمیانی کوردستان و جیهانی ئیسلامی و ئەزموونی بیرمەندانی مسوڵمان.
- پەرەپێدان و پەسەندکردنی ڕوانگەی زانستی مەنهەجی لە چارەسەرکردنی کێشە و گرفتە هزرییەکاندا و بێلایەنبوون لە پرسە خیلافییەکاندا و خۆبەدوورگرتن لە بڕیاری پێشوەخت و شێوازی سۆزدارانە و هەوڵدان بۆ بابەتیبوون.
- کاراکردنی کەلەپووری دەوڵەمەندی ئیسلامی و سوودوەرگرتن لە سەرچاوە گرنگەکانی بیری ئیسلامی لە کۆن و نوێدا و سەرلەنوێ هێنانەگۆی چەمکە فیکرییە دوێنراوەکان لە مێژووی ئیسلامیدا، بە ڕەچاوکردنی گۆڕانەکانی سەردەم.
- پەرەپێدانی چەمکی ئیعتیدال لە کایە فیکری و مەعریفییە جیاوازەکاندا و خۆبەدوورگرتن لە تێپەڕاندن و بەزایەدان.
- سەنتەر کاردەکات بۆ سەرلەنوێ و بەردەوام خوێندنەوەی هەردوو پەڕاوی قورئان و بوونەوەر بەپێی مەنهەج و میتۆدی زانستی و بەبێ چاولێکەری، بەڵکو بە نەفەسێکی تازە و بە سوودوەرگرتن لە عەقڵی ڕاشکاو و نەقڵی سەلمێنراو.

# تەواوكاری زانستەكان

.....................................................

لە بڵاوكراوەكانی سەنتەری زەهاوی بۆ لێكۆڵینەوەی فیكریی
ژمارە (٤٩)

• نووسینی: أ. د. طه جابر العلواني
• وەرگێڕانی: د. حەسەن محەمەد پشدەری
• بابەت: هزری
• دیزاین: ڕەوشت محەمەد
• چاپ: یەكەم

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی كتێبخانە گشتییەكان
ژمارە (   )ی ساڵی ٢٠١٧ پێدراوە

# ناوەڕۆك

# پێشەکی

سوپاس و ستایش بۆ خودای جیهانیان، داوای لێخۆشبوون و یارمەتی و ڕێنمایی لێ دەکەین و پەنا دەگرین بە پەروەردگار لە خراپی دەروون و کردەوە هەڵەکانمان.

دروود و سڵاو دەنێرین بۆ سەر گیانی پاکی محەممەد بەندەو نێردراو و پاڵفتەکراو و خۆشەویستی پەروەردگار و هەڵبژێردراوی لەنێو دروستکراوەکانی، هەروەها بۆ سەر گیانی خاو و خێزانە پاك و بێگەرد و هاوەڵ و هاوڕێ بەڕێزەکانی و هەرکەسێکیش شوێنی ڕێنماییەکانی بکەوێت، تا ڕۆژی دوایی.

لە پاشان: بەڕاستی قورئانی پیرۆز و بەشکۆ کە فەرمایشتی پەروەردگارە (بەرز و پیرۆز بێت) ناردوویەتی بۆ سەر دڵ و دەروونی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) بۆ ئەوەی ببێتە مژدەبەخش و ترسێنەر بۆ جیهان. ئەم قورئانە، ڕۆشنکەرەوەیەکی ئاشکرایە، یاد و باسە پڕ داناییەکانە، پەڕتووکی خودای بالأدەستە، خەڵکی لە کێشە و گرفتەکان دەردەهێنێت و لە مەینەتیەکان ڕزگاریان دەکات و دڵە نەخۆشەکانیش چارەسەر دەکات: **{يَهْدِي بِهِ اللَّهُ مَنِ اتَّبَعَ رِضْوَانَهُ سُبُلَ السَّلَامِ وَيُخْرِجُهُمْ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ بِإِذْنِهِ وَيَهْدِيهِمْ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ}** ﴿المائدە: ١٦﴾.

ماناى: بێگومان خوا بەم قورئانە پیرۆزە ڕێنموویی ئەو کەسانە دەکات کە شوێن ڕەزامەندی خوا کەوتوون، بەرەو ڕێبازەکانی ئاشتی و ئاسوودەیی و لە تاریکیەکان دەریاندەهێنێت و دەیانخاتە نێو ڕووناکییەوە بە فەرمانی خۆی و ڕێنموییشیان دەکات بۆ ڕێگە و ڕێبازی ڕاست. ئەو قورئانە پیرۆزە ڕێنماییمان دەکات بۆ ڕێگەی ڕاست، مایەی ڕزگارییە لە گومڕایی، سەرسوڕهێنەرەکانی کۆتاییان پێنایەت، بەهۆی زۆر خوێندنەوەو دووبارەکردنەوەیشی کۆن نابێت.

زانای پێشەوا، محەممەدی کوڕی وەزیر (لە ساڵی ٨٤٠ ك، کۆچی دوایی کردووە)، لەکاتێکدا دەیەوێت ئەوە دووپات بکاتەوە کە گەڕانەوە بۆ قورئانی پیرۆز، زۆر پێویستە، پێغەمبەری خوا (دروودی خوا لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی بێت) هانمان دەدات لەسەر پێویستی پێشخستنی لەسەر هەموو شتێکی دیکە، دەفەرمویت: ". . . با تەنها یەك فەرمودەی بەناوبانگ (مشهور) بەنموونە بهێنینەوە کە هاوشێوەکانیمان بەبیر دەهێنێتەوە، کە گەورە و پێشەوا ئەبو تالیب (سەلامی خوای لەسەر بێت) لە پەڕتووکەکەی (الأمالي) و هەروەها حافزی فەرموودەناس، پێشەوا ئەبو عیسای تیرمیزی[1] لە سوونەنەکەی

---

([1]) ئەم فەرموودەیە ئیمامی تیرمیزی لە جامیعەکەیدا (١٧٢/٥) بە ژمارە (٢٩٠٨) لە بابی (فضل القرآن) ڕیوایەتی کردووە، هەروەها خاوەنی کتێبی (إيثار الحق) لە کتیبەکەی (ترجيح أساليب القرآن على أساليب اليونان) لا:١٥ دار الكتب العلمية، هێناویەتی.

(الجامع الكبير)دا له حاريسى كوڕى عەبـدوڵلا دەيگێڕێتـەوە، هەمـەزانى هاوڕێى پێشەوا عەلى (سەلامى خواى لەسەر بێت) دەفەرمووێت: چـووم بۆ مزگەوت، بينيم خەڵك دەميان خستۆتە نێو قسە و قسەڵۆك و چيرۆك و شـتى بـێ سـوودەوە، چـووم بـۆ لاى پێـشەوا عـەلى (سـەلامى خـواى لەسەر بێت) ئەوەم پێ ڕاگەياند، فـەرمووى: ئـەو كـارە دەكـەن؟! وتم: بەڵێ، فەرمووى: دەبزانە گوێم لـە پێغەمبـەرى خـوا بـوو (دروودى خـوا لەسەر خۆى و بنەماڵەكـەى بێـت) دەيفـەرموو: (ألا إنهـا سـتكون فتنـة، فقلت: ما المخرج منها يا رسول الله؟ قال: كتاب الله فيه نبـأ مـا قـبلكم و خبر ما بعدكم، و حكم ما بينكم، و هو الفصل ليس بالهزل، من تركه مـن جبار قصمه الله، ومـن ابتغـى الهـدى في غـيره أضـله الله، وهـو حبـل الله المتين، وهو الذكر الحكيم، وهو الصراط المستقيم، هـو الـذي لا تزيـغ بـه الأهواء، ولا تلتبس به الألسنة، ولا يشبع منه العلماء، ولا يخلق على كثرة الرد، ولا تنقضي عجائبه، هو الذي لم تنته الجن إذ سمعتـه حتـى قـالوا: {**إِنَّا سَمِعْنَا قرأنا عَجَبًا يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ**} من قال به صدق، ومن عمل به أُجِر، ومن حكم به عدل، ومن دعا إليه هُدى إلى صراط مستقيم).

ماناى: بزانن له مەودوا فيتنه بـەرپا دەبێـت، وتم: ئـەى پێغەمبـەرى خوا ئەى دەرچە و فريادڕەسمـان چـى بێـت؟ فـەرمووى: بـا پـەڕتووكى پەروەردگار (قورئان) فريادڕەس و دەرهێنەرتان بێـت، چـونكە قورئـان هەواڵى گەلانى پـێش ئێـوەى تێدايـە و هـەواڵى دواى ئێوەشـى تێدايـە، فـەرمانڕەوا و داوەرە لـە نێوانتـان، بەڕاسـتى قورئـان جياكەرەوەيەكـە

گاڵتەی پێناکرێت، هەر کەسێك وازی لێ بهێنێت لە دەسەڵاتداران، خوا دەیشکێنێت، هەرکەسێك بێجگە لەو بەدوای ڕێنماییدا بگەڕێت، خوا گومڕای دەکات، ئەو گوریسی پتەوی خوایە، ئەو یادخەرەوەی پڕ دانابییە، ئەو ڕێگەی ڕاستە، ئەو بە ئارەزووبازی، خواروخێچی تێدا دروست نابێت، لەسەر زمانی ئیمانداران ئاسانە و لێیان تیکەڵ نابێت، زانایان تێری لێناخۆن، کۆن نابێت و بەهۆی زۆر خوێندنەوەو دووبارەکردنەوەی لێی بێزار نابین، ئەو، ئەو قورئانەیە کە جنۆکەکان وازیان نەهێنا کاتێك کە گوێیان لێ بوو، هەتا وتیان: **{إِنَّا سَمِعْنَا قرآنا عَجَبًا يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ}**.

مانای: ئێمە گوێمان لە خوێنراوەیەکی سەرسوڕهێنەر بوو، ڕێنمایی دەکات بۆ ڕێگەی ڕاست. هەرکەسێك بەم قورئانە قسە بکات ڕاست دەڵێت، هەرکەسێك کاری پێبکات پاداشتی دەدرێتەوە، هەرکەسێکیش فەرمانڕەوایی پێ بکات، دادپەروەری دەنوێنێت، هەرکەسێکیش بانگەوازی بۆ بکات ڕێنمای کراوە بۆ ڕێگەی ڕاست. (ئەم فەرموودە گەورەیە کۆتایی هات).

هەروەها زانای پێشەوا ئەبوتالیب (سەلامی خوای لەسەر بێت) بە سەنەدێکی دیکە نزیك لەو مانایە لە پەڕتووکەکەی (الأمالي) لە مەعازی کوڕی جەبەل (خوا لێی ڕازی بێت)(١) لە پێغەمبەری خواوە (دروود و

---

(١) ئەم ڕیوایەتەی مەعاز لە پێشەوا عەلی لە کتێبی (مجمع الزوائد)دا (٧/١٦٤) هاتووە.

سەلامی خوا لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی بێت) دەیگێڕێتەوە. هەروەها ئەبوسەعادات ئیبن ئەسیر لە پەڕتووکی (جامع الاصول) لە ڕێگەیەکی سێهەمەوە لە عومەری کوڕی خەتابەوە (خوا لێی ڕازی بێت)[1]

---

([1]) ئەم ڕیوایەتە لە ئیمامی عومەر (خوا لێی رازی بێت) لە کتێبی (جامع الاصول) بە ژمارە (٦٢٣٢) دەستتدەکەوێت، بەڵام لەویَ لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە (خوا لێیان ڕازی بێت) هاتووە، زانای لیکۆڵەری کتێبەکە مامۆستا عەبدولقادر ئەرنائوت دەفەرمووێت: لە وێنەی ڕەسەنی کتێبەکەدا بەو شێوەیە لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە (خوا لێیان ڕازی بێت) هاتووە، بەڵام لە چاپکراوەکەدا لە ئیمامی عومەرەوە هاتووە ئەو زانایە هیچ یەکێك لە ڕیوایەتەکانی بە پەسەند دانەناوە و جیاوازییەکی کەمی لەگەڵ ڕیوایەتەکەی ئیمامی ئەبوتاڵیب و ئیمامی تیرمیزی هەیە. ئەم فەرموودەیە زانای فەرموودەناس (ڕەزین)یش ڕیوایەتی کردووە، ئیبن کەسیریش لە کتیبی (فضائل القرآن)دا لە دوای فەرموودەکەی عەبدوڵلای کوڕی مەسعود بە مانا باسی کردووە، پاشان فەرموویەتی: ئەم فەرموودەیە ئەبو عوبەیدی قاسمی کوڕی سەلام لە کتیبی (فضائل القرآن)دا ڕیوایەتی کردووە و فەرموویەتی: ئەم فەرموودەیە لەم ڕووەوە غەریبە.

لە سونەنی دارەمییدا لە (٥٣٢/٢)دا بە ژمارە (٣٣١٥) لە عەبدوڵلاوە ئەم فەرموودەیە هاتووە و بەوە دەستپێدەکات کە دەفەرمووێت: (إن هذا القرآن مأدبة الله، فتعلموا من مأدبته ما استطعتم..). کۆتایی هێناوە بەوەی دەفەرمووێت: (فاتلوه فإن الله يأجركم على تلاوته...) بەڵام بەو لەفزەی کە هێناومانە ئیمامی دارەمی هێناویەتی بە ژمارە (٣٣٣١، ٣٣٣٢)... (نووسەر لێرە بەدرێژی باسی سەنەدی ئەم فەرموودەیەی کردووە، بە پێویستمان زانی کورتی بکەینەوە). (وەرگێڕ).

لە کۆتایی ئەم پەراوێزەدا، نووسەر دەفەرمووێت: ئەم فەرموودەیە لەوە زیاتر نییە کە فەرموودەی ئیمامی عەلی بێت (ڕەزای خودای لێبێت)، لەڕاستیدا فەرمایشتێکی جوان و ڕاستە لە ڕووی ماناوە، هاوشێوەی ئەم فەرموودەیە کەشایەتە لەسەر دروستی لەئیبن مەسعودەوە (ڕەزای خودای لێبێت) ڕیوایەت کراوەو ئایەتی ژمارەدوو لە سورەتی (جن)یش بەڵگەیە لەسەر دروستی مانایەکەی.

له هەندێك له سەرچاوەكانی شەرحكردنی فەرمووده‌كاندا پێناسەی (گرفتی فەرمووده، یان فەرمووده‌كان)ـیان بەوه كردووه كه بریتی بووه له: گرفتی وابەستەبوون به گێڕانەوەی فەرمووده و سوونەتەكان و وازهێنان له خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز و نەگەڕانەوه بۆ لای قورئان بەشێوەیەكی بەردەوام، هەندێكیشیان وتویانه بریتی بووه له: گێڕانەوەی فەرمووده و ڕووداوەكان به ڕەهایی، كەواته هەر كامێكیان بووبێت ڕێگر بووه له خەریكبوون به قورئانی پیرۆزەوه، هەندێك لەوانەی وا دەڵێن سوودیان لەو فەرموودانه وەرگرتووه كه ڕێگری له نووسینەوەی فەرمووده‌كان دەكەن و خەریكنەبوون به بێجگه له قورئانەوه، دووپات دەكەنەوه.

طه دەڵێت: بەڵام جیاوازییەكه زۆر گەورەیه له نێوان خەریكبوون به فەرمایشته ڕاسته بەرزكراوەكانەوه بۆ پێغەمبەر (دروودی خوا لەسەر خۆی و بنەماڵەكەی بێت) كه به شێوەی ڕوونكردنەوه به هەموو جۆرەكانیەوه بۆ قورئانی پیرۆز هاتووه، له نێوان خەریكبوون به فەرموودەوه به ڕەهایی، جیاوازییەكی گەوره هەیه له نێوان خەریكبوون بۆ ڕوونبوونەوه و خەریكبوون به مەبەستی دانانی فەرمووده له جێگای قورئان و بێنیاز بوون لێی، به بەڵگەی ئەوەی كه فەرمووده‌كان هەموو قورئان و مانایەكیان له خۆگرتووه، یان به هەر بەڵگەیەكی دیكه.

مەزهەبه فیقهییەكان له سەدەی چوارەمی كۆچییدا بەتەواوی جێگیر بوون و ڕاوەستان له تێكۆشان (الاجتهاد)ـی ڕەها، شوێنكەوتوانی مەزهەبەكانیش خەریكبوون به فەرموودەی پێشەوایەكانیانەوه و نووسینەوەی سەرگوزشته و ژیاننامەكانیان و كاركردن لەسەر كۆكردنەوەی خەڵك بۆیان، هەر كەس بۆ مەزهەب و پێشەواكەی خۆی.

هەندێكیان فەرموودەی ئەو پێشەوایانەیان وەك دەقه شەرعیەكان لێكردبوو، هەڵسەنگاندن و هەڵبژاردن و نەسخ و بابەتەكانی تایبەت به دەقه شەرعیەكانیان له دەقی فەرموودەی ئەو زانایانه بەكاردەهێنا. له سەردەمی هاوەڵاندا ـ بەتایبەتی سەردەمی پێشەوایان ئەبوبەكر و عومەر (ڕەزای خوایان لێبێت) ـ هیچ شتێك سەرقاڵی نەدەكردن له خەریكبوون به قورئانەوه، كاتێكساڵی چلەمینی كۆچیی تەواو بوو، چەندین تێڕوانینی فیقهی دەركەوت و خەڵكی پێیانەوه سەرقاڵ بوون.

کاتێکیش عەبدولعەزیزی باوکی عومەر والی بوو لە ساڵی (٨٣ هـ) بیری لە کۆکردنەوەی فەرموودە کردەوە، ئەوە پرۆسەیەك بوو کوڕەکەی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز تەواوی کرد، بۆ ئەوەی فەرموودەکان ببن بە فیقهێکی جێگرەوەی فیقهی خیلاف، بۆ ئەوەی خەڵکی بۆ لای بگەڕێنەوە و ڕێگە فیقهییەکان جیاوازی لەناویاندا دروست نەکات، بەڵام خەڵکێکی زۆر خۆیان بە فەرموودەوە خەریك کرد و وازیان لە قورئانی پیرۆز هێنا، بە بەڵگەی ئەوەی هەر مانایەکانی قورئانی پیرۆز بگریت لەنێو ئەو فەرموودانەدا هەیە و پەیوەندی پێوەی هەیە، لەنێو فەرموودەکاندا بەڵگەیان بۆ فەرموودەی پێشەوا فیقهییەکان هێنایەوە، پاشان سەرقاڵبوون بە فیقهی پێشەوایەکانەوە و وازیان لە فەرموودەش هێنا، وایان لێهات فەرموودەی پێشەوایەکانیان دەوتەوە و جۆر و بە شیان لێدەکردەوە، تاوای لێهات نزیکبوو بوترێت شەریعەت بریتیە لە فەرموودەی ئەو پێشەوایانە، بە شێوەیەك زانای بەناوبانگی حەنەفی مەزهەب (الكرخي) ڕێگەی بۆ خۆی خۆشکرد، تا بڵێت: (هەر ئایەتێك پێچەوانە بێت لەگەڵ ڕای هاوڕێیانی مەزهەبی ئێمە، ئەوە، یان دەبێت تەئویل بکرێت، یان نەسخ بووەتەوە)!!

(جا هەر پاساوێك بهێنرێتەوە بۆ مەبەستی ئەو زانایە، یان وتەکەی سادە بکرێتەوە.. لە ڕاستیدا هەر قسەیەکی زۆر بوێرانەیە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ڕەگەزپەرستی مەزهەبی لەو کاتەدا گەیشتووەتە ئاستی نەخۆشیی، بە شێوەیەك کە بنچینە بووەتە شوێنکەوتەی لق، بەڵکو بڕیاردەر لەسەری، کەواتە ناتوانین دووبارە بگەڕێینەوە بۆ بنیادنانەوەی ئوممەت و دەستکردنەوە بە ئامادەبوونی لە ڕووی شارستانیەتی و شایەتیدانی لەسەر خەڵکی، تاوەکو ئەم نەخۆشییە ترسناکانە تێنەپەڕێنین و چارەسەر نەکەین، خەڵکیش نەگەڕێنەوە بۆ قورئانی پیرۆز و نەیکەنەوە بە سەرچاوەی یەکەم و بنیادنەری بڕیارە شەرعییەکان و هەموو کاروبارەکانی ژیانمان، چونکە خوای گەورەو میهرەبان دەفەرمووێت: **{وَيَوْمَ نَبْعَثُ فِي كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا عَلَيْهِمْ مِنْ أَنْفُسِهِمْ وَجِئْنَا بِكَ شَهِيدًا عَلَى هَؤُلَاءِ وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِكُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَى لِلْمُسْلِمِينَ}**. (النحل: ٨٩)

مانای: ڕۆژێك دێت لە هەموو ئوممەتێکدا شایەتێك دەنێرین لە خۆیان بۆ سەر خۆیان، تۆشمان هێناوە ئەی محەممەد (درودی خوای لەسەر بێت) کە شایەت بیت لەسەر ئەو خەڵکە، قورئانیشمان بۆ تۆ دابەزاندووە، ڕوونکەرەوەی هەموو شتێکە، هیدایەتبەخش و ڕەحمەت و

دەیگێڕێتەوەو پاشان دەفەرموویت: ئەم فەرموودەیە زانایان تاوەکو ئێستا دەیگێڕنەوە، ئەم فەرمودەیە لەگەڵ ناسراویشی، مەرجەکانی زانایانی فەرموودەناسی تێدایە و لەلایەن زانایانی بنەمایەکانی شەریعەت (أصول الفقه) وەرگیراوە، کەواتە بەپێی کۆدەنگی زانایانی زانستی فەرموودەناسی و مەعقول، مانایەکەی دروستە.

خوای پەروەردگار لەنێو پەرتووکەکەیدا شەریعەت و پرۆگرامی تەواوی داناوەو ئێمەی پێ ڕزگار کردووە لە گومڕایی و دەرگاکانی میهرەبانی و ڕێگەکانی ڕێنمایی خۆی بەم قورئانە لە گەردوون کردووەتەوە.

دەی سوپاس بۆ خوای پاك و بێگەرد لەسەر ڕێنماییەکەی و سوپاس بۆ ئەو لەسەر چاودێری و چاکەکانی، خوای باڵادەست ئێمەی بێنیاز کرد لە هەموو شتێك، بێجگە لەم قورئانە، وەك خۆی دەفەرموویت:

---

مزگێنیشە بۆ موسوڵمانان، لە هەر شتێکیشی جیاوازییمان هەبوو، پێویستە بگەڕێینەوە بۆی، هەروەها بگەڕێینەوە بۆ سوونەتی پێغەمبەر (دروودی خوا لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی بێت)، چونکە خوای گەورەو میهرەبان دەفەرموویت: {. . **لِتُبَيِّنَ لَهُمُ الَّذِي اخْتَلَفُوا فِيهِ**. }. (النحل: ٦٤)

مانای: بۆ ئەوەی هەرچی ئەو شتانەی خەڵکی کێشەیان لەسەری هەیە، بۆیان ڕوون بکەیتەوە.

کەواتە ئەو مانایەی کە لە فەرموودەکەدا، یان ئەسەرەکەدا هاتبوو، مانایەکی دروستە و خودی قورئانی پیرۆز و فەرموودە صەحیحەکان شایەتی بۆ دەدەن. واللە اعلم.

**{أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّا أَنْزَلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ يُتْلَى عَلَيْهِمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَرَحْمَةً وَذِكْرَى لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ}**. (العنكبوت: ٥١)

ماناى: ئايا بەس نييە بۆيان كە بەڕاستى ئێمە قورئانمان دابەزاندووە بۆت و بەسەرياندا دەخوێنرێتەوە، بێگومان لەو قورئانەدا ڕەحمەت و يادەوەرى ئاشكرا هەيە بۆ ئەو كەسانەى كە ئيمان دەهێنن.

لە خواى بەرز و بڵند داوا دەكەين وەك چۆن قورئانى گەورەو پێغەمبەرى بەڕێزى (درووود و سەلامى خوا لەسەر خۆى و بنەماڵەكەى بێت) پێ بەخشين، ئاواش قورئانى پيرۆز بكاتە بەهارى دڵەكانمان و ڕووناكى چاو و دڵمان و ئەوەى لێى نازانين فێرمانى بكات، ئەوەى لەبيرمان براوەتەوە لێى، بەبيرمان بهێنێتەوە و بيكات بە بەڵگە بۆمان، نەك لە سەرمان و ئەم قورئانە دەستمان ڕابكێشێت بۆ بەهەشتى بەرين، ئەو بيسەر و وەڵامدەرەوەيە.

## فەرمانكردن بە هەردوو خوێندنەوەكە:

خواى گەورە هەر لە سەرەتايەكانى ناردنە خوارەوەى قورئانى پيرۆز و لە سەرەتاى ناردنى سرووشەوە، فەرمانى بە پێغەمبەرەكەى (درووود و سەلامى خوا لەسەر خۆى و بنەماڵەكەى بێت) كردووە بە دوو جۆر لە خوێندنەوە، خواى گەورە دەفەرمووێ: **{اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ (١) خَلَقَ الْإِنْسَانَ مِنْ عَلَقٍ (٢) اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ (٣) الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ (٤) عَلَّمَ الْإِنْسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ (٥)}**. (العلق: ١ـ٥)

**مانای: ئەی محەممەد (دروودی خوای لەسەر بێت) بخوێنـە، بـەناوی ئـەو پەروەدگارەتـەوە کـە هـەموو شـتێکی دروسـتکردووە، مرۆڤـی لـە خوێنپارەیەکی هەڵواسراو دروستکردووە، بخوێنە پـەروەردگاری تـۆ لـە هـەموو کـەس بەخـشندەترە، مرۆڤـی فێـری ئـەو شـتانە کـردووە کـە نەیزانیوە.**

**لەبەرئەوەی قورئانی پیرۆز دووبارەبوونـەوە و هاوواتـایی (مـترادف) تێدانییە، ئایەتە پیرۆزەکانیشی پێویستی بە بـەکارهێنانی ئامرازەکـانی دووپاتکردنەوە نییـە، بۆیـە هەروشـەیەك لـە وشـەکانی - ئەگەرچـی لـە سەرەتاوە هاوواتا، یان هاوشێوە دەربکەوێت، لەگەڵ وشەیەکی دیکـە - بەڵام مانایەکی نوێ و جیاواز لەخۆدەگرێت، چونکە ئەگەرچی بە خودی وشەکەش، بە بەکارهێنانی قورئانییش بۆی ئەو مانایە نەگەیەنێت، بەڵام لـە بـوار و میانـەی ڕیزبەنـدیی (الـسیاق)ـی[1] وشـەکاندا و بـەپێی**

---

[1] مەبەست بە ڕیزبەندی (سیاق): ڕیزبەندی لە قورئـانی پـیرۆزدا بریتیـە لـە بەرهەمهێنـەری گەیاندنی مانا و ئاراستەکەر بۆ ماناکـان، لەگـەڵ زۆر بایەخـدانی ڕەوانبێـژەکانیش بـەم بابەتـە و قسەی زۆریان لەبارەیەوە، بەڵام نابینین پێناسەیەکی گشتگیر و تەواویان بۆ کردبێت، وەك بڵێـی وایـان دانـاوە کـە بـەبێ پێناسـەکردن، مانایەکـەی دەزانـدرێت، یـان وتویانـە بـە باسـکردنی، وەسفەکانی ڕوونکردنەوەی شـوێنەوارەکانی، بۆیـە پێناسـەیان نـەکردووە. زانایـانی ئوصـوڵیش گرنگییەکی زۆریان داوە بە مانای ڕیزبەندی (السیاق)، چونکە ڕیزبەنـدی ڕێنماییمـان دەکـات بـۆ ڕوونکردنەوەی ڕستە کورتەکان و دیارییکردنی مانا لێکنزیك و تێکەڵەکان و دڵنیاکردنمان لـەوەی تەنها لە ڕیزبەندییەکە دیارییکراوە، هیچ مانایەکی دیکە هەڵناگرێت، چونکە مانای دەقـەکان دوو جۆرن: مانای ڕاستی (الحقیقي) و زیادە (إضافي)، مانای ڕاستی، شوێن ویستوو مەبەستی قسەکەر

ڕەچاوکردنی شوێن و پـێش و پـاش (سـیاق)ـی[1] هـەر مانایـەکی تـازە دەگەیەنێت، ئەمەش لە نیشانەکانی ئەو ئیعجازەیەتی کە بەرز و باڵاتری کردووە لە قسە و ئاخافتنی مرۆڤەکان، بۆیـە شـێوازی فـەرمانکردن بـە خوێندنەوە ـ کە دوو جار لەم پێنج ئایەتەدا دووبارەبووەتەوە ـ مانـای دووپاتکردنەوە، یان هاوواتـایی، یـان دوبارەکردنـەوە ناگەیـەنێت، وەك هەندێك لە زانایانی ڕاڤەکردنی قورئانی پیرۆز بـۆی ڕۆیـشتون[2]، بـەڵکو

---

دەکەوێت و ئەم جۆرەیان جیاوازی تێدا دروست نابێت، بەڵام زیادە (إضـافي) شـوێن تێگەیـشتنی گوێگر و چاکی هزر و زیرەکی و ڕوونی مێشك و شارەزایی بـە وشـەکان و پایـەکانیان دەکـەوێت، ئەم جۆرەیان جیاوازی زۆری تێدا دروست دەبێـت بـە گـوێرەی جیـاوازی گوێگرەکـان بـۆی. . . بگەڕێوە بۆ (بدائع الفوائد لإبن القيم) (٩١٤/١٠) واعلام الموقعين (٣٥٠/١، ٣٥١)، کچی خۆمان د. ڕوقیە درێژەیەکی گرنگی لە بەرای مانای سیاق هێناوە و ئەو دابەشبوونانەشی لـە کـۆن و نوێدا بۆ کراوە، هێناویەتی، بەشێوەیەك کە توێژەران لـەم بارەیـەوە بێنیـاز نـابن لـە گەڕانـەوە بـۆی، بۆیە بگەڕێرەوە بۆ ئەم بابەتە لە توێژینەوە بەنرخەکەی (اثر العرف في فهم النـصص: قـضاية المراة انموذجا) رسالة الدكتورا، طبع ونشر و توزيع دار الفكر في دمشق، عام (١٤٣٢هـ/٢٠٠٣م) (ص٢٦٠-٢٦٥). هـەروەها بگـەڕێوە بـۆ توێژینـەوەی هاوڕێمـان (ابـراهيم اصـبان) کـە بەهۆیـەوە نمـرەی دکتۆرای بەدەستهێناوە بە ناونیشانی (دلالة السياق في القرأن) تا ئێستا چاپ نەکراوە بە چاپێکی گشتی.

[1] بەڵام (السباق) زۆر نزیکـە لـە (الـسباق) کاریگەرییـەکی زۆری لەسـەر زانـینی هۆکارەکـان هەیە، بریتیە لە بەستنەوەی وشەکان و ئایەتەکان و سوورەتەکان بـەپێش خۆیانـەوە و کردنیـان بە یەك ئەڵقە لەنێو زنجیرەکی پێکەوەبەستراودا.

[2] وەك (القرطبـــي) کـــە پێیوایـــە (اقـــرأ)ی دووهـــەم دووپاتکردنەوەیـــە و کردوویـــەتی بـــە تەواوکەری ئایەتی یەکەم (١١٩/٢٠). (الآلوسي) (١٨٠/٢٩)، باسنەکردنی وشەی (اقرأ)ی دووهـەم لەلایەن (الطبري) ئاماژەیـە بـۆ ئـەوەی کـە پێیوایـە هاوواتایـە، یـان دووپاتکردنـەوەی یەکەمـە،

دوو فەرمان دەگەیەنێت بە دوو خوێندنەوە، هەریەکەیان مەبەست پێی مانایەکی سەربەخۆیە و هەریەکەیان تایبەتمەندی و مەیدان و پەیوەندی و شێوازی جیای خۆی هەیە.

---

بگەڕێوە بۆ (٢٥٣/٣٩) لە تەفسیر (الطبري)، بەڵام پێشەوا ڕازی هەریەك لەو دوو (اقرأ)ـانەی بۆ مانایەکی سەربەخۆ ڕاڤە کردووە، لە هەندێك لەزانایان نەقڵ دەکات و دەفەرمووێ: (اقرأ)ی یەکەم بۆ خۆتە، هی دووهەم بۆ ڕاگەیاندنە، یان هی یەکەم بۆ فێربوونە لە جیبریل و هی دووهەم بۆ فێرکردنە، یان هی یەکەم بۆ نوێژی خۆتە، هی دووهەم بۆ دەرەوەی نوێژەکەتە). بڕوانە: تەفسیرەکەی (١٦/٣١). (البغوي)ـش لە تەفسیرەکەیدا (معالم التنزیل)دا دەفەرمووێ: (اقرأ) بۆ دووپاتکردنەوە دووبارەی کردووەتەوە، پاشان بە ڕستەیەکی نوێ دەستی کردووە.. وربك الاکرم) (٤٧٩/٨).

هەرچی (ابن كثير)ـە لەبارەی (إقرأ)ی یەکەم و دووهەم هیچی باس نەکردووە (٤٥٩/٨)ط. دار الشعب، القاهرة، و (ابن الجوزي) لە کتێبی زاد المسير (١٧٦/٩) پێیوایە (إقرأ)ی دووهەم بۆ دووپاتکردنەوە (تأکید) هاتووە. (ابن عاشور)یش لە تەفسیرەکەی (التحرير والتنوير) (١٣٣/٢٠) سێ وتەی لەو بارەیەوە هێناوە: لە دووهەمینیان، لەوانە، دەڵێت: (. . پیتی (باء) لە (باسم ربك) بۆ هاوەڵداری (المصاحبة) هاتووە، (اسم) لە ڕستەکەدا دەبێتە حاڵ بۆ ئەو ڕاناوە(ضمير)ەی کە لە (اقرأ)ی دووهەمدا شاردراوەتەوە و پێش بکەر (عامل)ـەکەی کەوتووە بە مەبەستی تایبەتکردن (الاختصاص). مانای: هاوڕێ لەگەڵ ناوی خودات، ئەوەی لەمەودوا بۆت سرووش (وحی) دەکرێت، بخوێنەرەوە. هاوڕێیەتی ناوی خودا بۆ تێبینیکردنی گەورەییەکەیەتی، ئەمەش بۆ جێگیرکردنی تاك و تەنیایی خودایە لە خوایەتیدا..).

ئەم ڕایە نزیکترینیانە لە مەبەستی ئێمە، بەڵام (الطوسي) پێیوایە پیتی (باء) زیادەیە، مەفعولی (إقرأ) بریتیە لە (اسم ربك)ـە، (إقرأ)ـی دووهەمیش مەفعولەکەی شاردراوەیە کە بریتیە لە (القرآن). بڕوانە التبيان: (٣٧٩/١٠).

بۆ پاڵپشتی لەم مانایەی سەرەوە، فەرمانکردن بە خوێندنەوە لە ئایەتی یەکەم لەگەڵ وشەی {**اسْـمِ رَبِّـكَ**} هاتووە و پەیوەندی و وابەستەی (صلە) وشەی {**الـذي**}ـیە بریتییە لە وشەی {**الخلـق**} لە ئایەتی {. . . **الَّذِي خَلَقَ(١) خَلَقَ الْإِنْسَانَ مِنْ عَلَقٍ (٢)**}. (العلق: ١، ٢)، کەواتە لێرەدا فەرمانکردنە بە فەراهەمهێنانی کرداری خوێندنەوەو مەشقکردنە لەسەری، لەگەڵ داواکردنی هاوکاری لە خوای بەرز و بڵند، چونکە ئەو پەروەردگارەتە و دەزانێ تۆ: {**ومَا كُنْتَ تَتْلُو مِنْ قَبْلِـهِ مِـنْ كِتَابٍ ولاَ تَخُطُّهُ بِيَمِينِكَ إِذًا لاَرْتَابَ الْمُبْطِلُونَ**}. (العنكبوت: ٤٨)

مانای: تۆ ـ ئەی محەممەد ـ پێشتر هیچ کتیبێکت نەدەخوێندەوە و بەدەستی راستت نەتنووسیووە (ئەگەر وا بوایە) ئەوکاتە ناڕاستەکان (بێباوەڕان) دەکەوتنە گومان سازدان کە گوایە دانراو و هەڵبەستراوی خۆتە.

بۆیە ئەو (پێت دەخوێنێتەوە بە شێوەیەك هیچکات لە بیرت ناچێتەوە)، بە پێچەوانەی هەموو خوێنەرێکی دیکە کە دەگونجێت لەبیری بچێتەوە، یان هەڵە بکات، کەواتە بە ناوی ئەو بخوێنەوە، خۆت پەنا بدە بە ئەو لە شەیتانی نەفرەتلێکراو: {**فَإِذَا قَرَأْتَ القرأن فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ**}. (النحل: ٩٨)

مانای: ئەگەر هەر کاتێك ویستت قورئان بخوێنیت پەنا بگرە بەخوا لە شەیتانی نەفرەتلێکراو.

ئەو پەروەردگارەی کە تۆ و هـەموو مرۆڤايـەتی لـە زەرووێـك (علـق) دروستکردووە، توانـای هەيـە کـرداری خوێندنـەوەش لـە تـۆدا دروسـت بکـات، بـا پێـشتريش توانـايی خوێندنـەوەت نـەبووبێت، تـەنها ئـەوەی پێويستە لەسەرت ئەوەيە کە ئەوەی بۆمان سرووش (وحي) کردوويـت ـ کە قورئانە ـ بيخوێنيتەوە. ئەو پەروەردگارەی کە تۆی دروستکردووە و گەورە کردووە لە زەروو (علق) و چاودێری کردوويت و هەموو شتێکی بە ئەنـدازە و ڕێکـوپێکی دروسـتکردووە، توانـای ئـەوەی هەيـە کـە فێـری خوێندنەوەشت بکات، وەك چۆن ئادەمی (سەلامی خـوای لەسـەر بێـت) فێری ناوی هەموو شـتەکان کـرد، هـەروەها وەك چـۆن بابـە گـەورەت، ئيبراهيم و هەموو پێغەمبەران و نێردراوانی فێر کرد، ئاوا بە نـاوی ئـەو، لەسەر ناوی ئەو، لەگەڵ ناوی ئەو، بخوێنەوە.

لەمەشـدا، بـەڵکو هـەر لـە سـەرەتاوە ئاگادارکردنەوەيـەك هەيـە بـۆ جياوازی پێغەمبەر (دروود و سەلامی خـوا لەسـەر خـۆی و بنەماڵەکـەی بێـت) لەگـەڵ گـەل و هۆزەکـەی لـەوەدا کـە ئـەوان کارەکانيـان بـە پـشتبەستن بـە لات و عـوززا و مـەناتی سـێهەمين دەسـتپێدەکرد، کـە ئەمانە هـەمويان بـت بـوون، بـۆ خۆيـان دروسـتيان دەکـردن و بتـەکان ئەوانيان دروست نەکردبوو، بەڵام پێويستە پێغەمبەر (دروود و سـەلامی خوا لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی بێت) بە ناوی خوا و بە پـشتبەستن بـە پەروەردگار خوێندنەوەو هەموو کارەکانی دەستپێبکات.

هەروەها لە فەرمایشتی: {. . خَلَقَ (١) خَلَقَ الْإِنْسَانَ مِنْ عَلَقٍ (٢)}دا ئاگادارکردنەوەیەك بۆ پێویستی خوێندنەوە بۆ بەدیهێنراوەکان هەیە، بەشێوەیەك کە دەستپێبکات بە خوێندنەوە بۆ خودی مرۆڤایەتی، هەر لە سەرەتای دروستبوونەوە تا کۆتایی ژیان بە هەموو دۆخ و قۆناغەکانیەوە، کەواتە بەرنامەی قورئان بۆ خوێندنەوەی بەدیهێنراوەکان لە خوێندنەوەی خود بە ئاراستەی بوونەوەر و ئاسۆیەکانی دەستپێدەکات، کە لە ڕاستیدا ئەمەیە خوێندنەوەی گونجاو و دروست.

دەستپێکردن بە یەکتاپەرستی پەروەردگاریەتی (توحید الربوبیة)، نەك یەکتاپەرستی خوایەتی (توحید الألوهیة) ئاگادارکردنەوەی تێدایە بۆ هەنگاوێکی دیکەی بەرنامەدار، کە بریتییە لە دەرچوون لە بەرجەستەکانەوە بەرەو ڕووی نابەرجەستەکان، چونکە مرۆڤ توانای زیاتری هەیە بۆ تێبینیکردنی شتە بەرجەستەکان، نەك تێڕوانین و تێبینیکردنی نابەرجەستەکان، لەبەر ئەوەی دروستکراوەکان و جوانیی دروستکردنیان و ڕێکخستنیان و ڕێسا و یاسایەکانیان بریتین لە شتە بەرجەستەکان کە دەبینرێن و بە هەموو هۆکارەکانی هەستپێکردن، هەستیان پێدەکرێت، بەڵام نابەرجەستە بریتییە لە یەکتاپەرستی (التوحید) بە هەموو جۆرەکانیەوە کە ـ بە تێڕوانینێکی دروست لە شتە بەرجەستەکان ـ پێی دەگەین.

کەواتە تێڕوانین بۆ شتە بەرجەستەکان کۆتایی ڕێگەکە نییە، بەڵکو سەرەتایە بۆ تێڕوانین و گەیشتن بە نابەرجەستەکان.

لێرەدا دەگونجێت مرۆڤ هەست بە کرداری پەنهان (فعل الغيب) بکات لە ژیانی ڕۆژانەیدا و لەوێوە بگات بەو گرێدانەی کە پێویستە لە نێوان پەنهانی (الغيب) ـ بە هەموو پێکهاتەکانیەوە ـ و لە نێوان مرۆڤ و بوونەوەردا، دروستی بکات.

## خوێندنەوەی یەکەم:

کەواتە فەرمانی یەکەم بە خوێندنەوە بریتیە لە فەرمانکردن بە خوێندنەوەیەك کە[1] بە ناوی خواوە بێت، یان لەسەر ناوی خوای باڵادەست و لەگەڵ ئەو بێت، بۆ ئەو سرووشانەی (کە بەدوای یەکدا بۆ پێغەمبەر (درووود و سەلامی خوا لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی بێت) دێتە خوارەوە و بەردەوام دەبێت هەتا دەبێتە قورئانێکی گەورەو بەڕێز و پارێزراو، قورئانێك ئایەتەکانی ڕوون و ئاشکراو دامەزراو و یەکانگیر و لەگەڵ یەك گونجاو و وێکچوو دەبێت، ئەی محەممەد دەیخوێنیتەوە بۆ خەڵکی و بۆیان ڕون دەکەیتەوە بۆ ئەوەی لێوەی فێری ڕێنمایی و هۆش و گرتنەبەری ڕێی ڕاست بن، تا دەروونیان پاك ببێتەوەو ژیانیان بە خاوێنی بڕوا بەڕێوە، ڕێنمایی لێوەربگرن لەکاتی جێبەجێکردنی کارەکانی جێنیشینییدا (الخلافة)، لە کاتی هەستانیان بەجێبەجێکردنی

---

[1] بگەڕێرەوە بۆ تەفسیری ڕازی، ئەو ئەو ڕایەی بەلاواز داناوە - کە ڕای زۆرێك لە موفەسیرینیشە - کە دەڵێت: پیتی (باء) لە (باسم ربك) زیادە و ئەو ڕایە هەڵدەبژێرێت کە دەڵێت زیاد نییە و سێ ڕای لەبارەوە باس دەکات (١٣/١٣-١٤). بشڕوانە تەفسیری (التحرير والتنوير) (٤٣٦/٢)، لەوێ دەفەرمووێ: پیتی (باء) بۆ هاوکاری وەرگرتن (الاستعانة) و هاوڕێیەتی (المصاحبة)ـیە، یان بە مانای (علی)ـیە، ئەمەش نزیکە لەوەی ئیمامی ڕازی باسی کردووە.

ئیمامی ئالوسیش لە (روح المعاني) ط: مكتبة دار التراث — القاهرة، هەر وا دەفەرموێت، (الطباطايي) لە (الميزان) دەڵێت: پیتی (باء) بۆ هاوکاتییە (الملابسة)یە. (٣٢٣/٢٠)

ئـەو ئـەرك و ئەمانـەت و مـافی ئاوەدانکردنەوەیـەی کـە لەسـەر شـانیان دانراوە.

جا گومانی تێدا نییـە کاتێـك کـە پێغەمبـەر (درووود و سـەلامی خـوا لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی بێت) وەڵامی دایەوە بەوەی کە ئەو خوێنـەر نییە و توانای خوێندنەوەی نییە[1] جوان لـە مەبەسـتەکە تێگەیـشتبوو، کە بریتی بوو لە خوێندنەوەی ئەوەی کە بۆی دەخوێنرێتەوە، لەکاتێکدا کە ئەو نازانێت بخوێنێتەوە و بنووسێت و زانیاری لەسەر ئەو شتە نییە کە دەیخوێنێتەوە، هەر بۆیە خوای گەورە خوێندنەوەی لـە ئایەتەکـەدا بەستەوە بەناوی خۆیەوە و فەرمووی: **{بِاسْمِ رَبِّكَ}**.

هەروەکو ئەوەی پێی بفەرموویێت: تۆ لە ئەنجامدانی ئەو کـارەی کـە نایزانیـت تـەنیا نابیـت، بـەڵکو ئـەو پەروەردگارەشـت کـە زۆر شـتی پێبەخشیویت لەگەڵ دەبێت و توانای هەیە لەسەر ئەوەی فێرت بکـات، بەدیاریکراوی چۆن ئەو فەرمانانـەی پێـی کـردووی جێبـەجێیان بکـەی، سەرەرای ئەوەش شتێکی دیکـەت پێدەبەخـشێت کـە ئـەویش ئەمەیـە: هەروەك چۆن ئادەمی فێری هەموو ناوەکان کرد، چۆن ئیبراهیم و موسا

---

[1] ئاماژەیە بۆ فەرموودەی (بدء الوحي) کە ئیمـامی بوخـاری ڕیوایـەتی کـردووە لـە بـابي (كيف بدأ الوحي إلى رسول الله صلى الله عليه وسلم) وقول الله ـ جل ذكره ـ: {**إِنَّا أَوْحَيْنَا إِلَيْـكَ كَمَا أَوْحَيْنَا إِلَى نُوحٍ وَالنَّبِيِّينَ مِنْ بَعْدِهِ**} (النساء: ١٦٣) الحديث رقم: (٢، ٣).

و عیسا و بێجگە لەوان، لە پێغەمبەران و نێردراوانی (سەلامی خوایان لەسەر بێت) پێش تۆی فێر کرد، ئاوا بە ناوی ئەو بخوێنە.

داوای یارمەتی لە ئەو بکە بۆ خوێندنەوەکەت، ئەو یارمەتیت دەدات و لەگەڵت دەبێت بۆ ڕوونکردنەوەی بۆ خەڵك و فێرکردنیان و بە بەڵگەهێنانەوەی بۆیان.

کە پەروەردگار لە ئایەتەکەدا باسی خودی مرۆڤ و بە دیارییکراوی باسی دروستکردن دەکات، دەیەوێت دڵنیایی ببەخشێت بە پێغەمبەر (درووود و سەلامی خوا لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی بێت) بەوەی کە بەخشینی توانای خوێندنەوەی سرووش، شتێکی ئەوەندە قورس و گران نییە بەلای ئەو خوایەوە کە هەموو شتێکی دروستکردووە و مرۆڤیشی لە زەروو (علق) دروستکردووە، (بەڵکو ئەوەیانی زۆر بەلاوە ئاسانترە).

هەروەها لە باسکردنی دروستکردن (خلق) لە ئایەتەکەدا، ئامادەکردنی هزر و مێشك و دەروونی پیرۆزیەتی (درووود و سەلامی خوا لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی بێت) بۆ ڕوونکردنەوەو باسکردنی جۆری دووهەم لە خوێندنەوە.

## خوێندنەوەی دووهەم:

بریتیـە لـە خوێندنـەوەی گـەردوون و تێـڕوانین لـە دروسـتکراوەکان و زانینی ئەوەی مرۆڤەکان بە پێنووسەکانیان تۆماریان کردووە لـە تێـڕوانین و تێگەیشتنیان بۆی و ئەو ئەزموونەی لەو تێڕوانینەیان فێـری بـوون، هـەر بە گوێرەی ئەم خوێندنەوەیەش، قورئانی پـیرۆز (بەڵگـەی دروسـتکردن و بەڵگـەی بـەدیهێنانی داڕشـتووە و داوای لـە مـرۆڤ کـردووە تێـڕوانینی لۆژیکییانـە بکـات بـۆ بـوون و تێـڕوانین و خوێندنـەوەش بـۆ شـوێنەواری گەلانی پێشین و زانینی ئەوەی کەبەسەریان هاتووە، بکات).

بـەم شـێوەیە، ئـەم خوێندنەوەیـەی فـەرمانی پێکـراوە دەبێتـە دوو خوێندنـــەوە: خوێندنەوەیـــەك بـــەناوی خـــوا بـــۆ قورئـــانی پـــیرۆز، خوێندنەوەیەکیش بۆ گەردوونی دروستکراو و هەرشتێك کـە پەیوەنـدی پێوەی هەبێت لە جیهانی دروستکراو و ویستی خوایی (التـشیؤ)، لـەنێو ئەوانیشدا خوێندنەوە بۆ کەلـەپوور و شـوێنەواری ئـەو گەلانـەی خـوای گـەورە چـیرۆکەکانیانی لەقورئانەکەیـدا تۆمـاری کـردوون، چـونکە بـە هەردوو خوێندنەوەکە جیاوازی لە نێوان ئەو گەلانەدا دەردەکـەوێت کـە سوودیان لە سرووشی خوایی وەرگرتووە و شوێنی کـەوتوون و ژیانیـان پێ ڕۆشن کردووەتەوە، ئەو گەلانەیشی سرووشیان پشتگوێ خستووەو تــەنها مامەڵـەیان لەگـەڵ سرووشــت (**الطبیعــة**) و گەردوونـدا کـردووە، بێئەوەی ڕێگەی ژیانیان بـە ڕێنمـایی سـرووش ڕۆشـن کردبێتـەوە، یـان گـەردوون و ئـەزموونی مرۆڤایـەتی و ئـەو پەنـدو ئامۆژگارییانـەی کـە

پێویسته لێی وەربگیرێت به درێژای مێژوو فەرامۆش کردووه و تەنها هەستاون به خوێندنەوەی ئەو سرووشەی بۆ سەر دڵی پیغەمبەر (درووود و سەلامی خوا لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی بێت) هاتووه، به بیانووی ئەوەی تەنها ئەو بەسه بۆ ژیان و ڕۆچوون تیایدا. هەرکەسێك بیەوێت سرووش (وحي) به وردی و قوڵی بخوێنێتەوه ئەوه هیچ کات بێنیاز نابێت له خوێندنەوەی گەردوون و ئەوەی تیایدایەتی، ئەوەش بەوەی وردبێتەوه له پسپۆڕی و ئەزموونی گەلانی پێشوو، هەروەها کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر شارستانیەتەکانی ڕابردوو کەچۆن بەرپا بوون و گەوره بوون و پاشان لەنێوچوون و کۆتاییان پێهاتووه.

بەڕاستی قورئانی پیرۆز گرنگییەکی لەڕادەبەدەری بەم خوێندنەوەیه داوه و له چەندین سوورەت و زۆرێك له ئایەتەکانیشدا سەرنجەکانیشی بۆ لای ڕاکیشاوه، لەبەر ئەوەی به جۆریك دەرس و پەند و ئامۆژگاری تێدایه که وادەکات نەوەی ڕابردوو توانایان هەبێت و سوود بگەیەنن به نەوەی داهاتوو، با کات و ساتی زۆریش لەنێوانیاندا بێت، وا دەکات نەوەی داهاتوو ئەنجامی کار و کرداری نەوەکانی پێش خۆیان ببینن، ئەوکات هەست دەکەن بەوەی که کردەوەکانی ئەوانیش وەك کردەوەی نەوەی ڕابردوو به باش، یان به خراپ شوێنەوار و دەرئەنجامی دەبێت، بەمەش بنەمای (بەرپرسیارەتی تاکی، کاریگەربوونی گشتی، یان کۆمەڵگه) جێگیر دەبێت، لەوێوه مرۆڤەکان فێری پابەندبوون و ڕێکوپێکی دەبن له کار و هەڵسوکەوتەکانیان و عەقڵ و دەروونیشیان بۆ قبوڵکردنی بنەمای

(پاداشت و سزا) ئامـادە دەبێـت، فێـری تێـڕوانین و وردبوونـەوەش دەبـن لەوەی بە میرات لە باوکەکانەوە بەجێدەمێنێت بەتێڕوانینیکی پەندئامێز و رەخنەگرانە، پاشان ڕزگاریان دەبێت لە زاڵبوونی بنەمای (باوك سالاری) و لاساییکردنەوە و شوێنکەوتنی کوێرانە، لە ڕاست و ناڕاستدا، هەروەها فێـر دەبـــن کـــە لـــە دواڕۆژدا (یـــوم القیامـــة) ئـــەو گەلانـــەی رابـــردوون دەستکەوتەکانیان بۆ خۆیان دەبێت و ئێمەش دەستکەوتی خۆمـان بـۆ خۆمان دەبێت و هیچ کەسیکمان لـەلای خـوای پـەروەردگار سـوودمان بـۆ ئەوی دیکەمان نابێت.

## خوێندنەوەی دوو کتێبەکە:

کەواتــە بۆمــان دەرکــەوت: بــۆ ئــەوەی مــرۆڤ ڕزگــاری بێــت لــە دەردی کۆیلایـەتی بـە هـەموو جـۆر و ماناکانیـەوە، پێویـستە دوو کتێـب بەیەکـەوە بخوێنێتـــەوە: کتێبێکیـــان خـــوای باڵادەســـت ناردویەتیـــە خـــوارەوەو دەخوێنریتـــەوەو دەستەوەســـتانکەر (معجـــز)ـــە کـــە قورئـــانی پـــیرۆزە، کتێبێکیشیان دروسـتکراوەو هەمیـشە کراوەتـەوەو ئاوەڵایـە کـە گـەردوون و دروسـتکراوەکانی ناویـەتی و ئـەزموونی مرۆڤایەتییـە لەنێویـدا، لەنێویـشیدا مامەڵەیە لەگەڵ خودی مرۆڤەکان، چونکە مرۆڤیش بەشێکە لـە سرووشـت و کوڕی شەرعی سرووشتە، خوای گەورە دەفـەرمووێت: **{مِنْهَا خَلَقْنَاكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَى}**. (طه: ٥٥) مانای: ئێمە ئێوەمان هـەر لەم زەویە دروستکردووە، پاشانیش هەر دەتانگەڕێنینـەوە نـاوی، پاشـان جارێکی دیکە دووبارە لەم زەویە دەرتاندەهێنینەوە.

## خوێندنەوەکە دەبێت مرۆڤانەبێت

ئـەم خوێندنەوەیـەش پێویـستە لـە مرۆڤـەوە دەسـتپێبکات، ئـەو پێویستە هەردوو خوێندنەوەکە ئەنجام بدات، بۆ ئەوەی زانیاری لەسـەر ئاوەدانکردنەوەی زەوی بە تەواوی پەیدا بکات، بەشـێوەیەك بتوانێـت ئـەو پەیمانـەی داویـەتی جێبـەجێی بکـات و ئـەو ئەمانەتـەی لەسـەر شانیەتی بیگەیەنێتە شوێنی خۆی و هەستێت بە کاروباری جێنـشینی و پێویـستیەکانی ئاوەدانکردنـەوە دابـین بکـات و لـەو تاقیکردنەوەیـەی تووشی بووە، سەرکەوتن بەدەستبهێنێت.

ئەمەش بەتـەنها لـە ڕێگـەی وەرگـرتن و پێوتنـەوەوە فێـری نابێـت، بەڵکو بە وەرگرتن لە غەیری خۆیشی، لە گەلانی پێشین و هاوسەردەمی خۆی، دەبێـت وەریبگریـت بـە گەڕانـەوە بـۆ مێـژوویان و خوێندنـەوەی پـەڕتووك و نووسـینەوەو وەرگێڕانـی گـەلان و گواسـتنەوەو ئـاڵوگۆڕی پسپۆڕیی و شارەزایی و زانست و زانیاری لەنێوان مرۆڤ و درێغی نەکردن لە وەرگرتنی شارەزایی و زانست لە هەر شوێنێك هەبێت و مامەڵـەکردن لەگەڵیدا بەشێوەیەکی بەرنامە بۆ داڕێژراو.

## یەکێتی مرۆڤایەتی:

لەمەشــدا یــەکێتی مرۆڤایــەتییمان بــۆ ڕوون دەبێتــەوەو پێویــستی نەوەکانی داهاتوومانبۆ دەردەکەوێت بۆ سوودوەرگرتن لە تایبەتمەنـدی و ئــەزموون و شــارەزایی گــەلانی ڕابــردوو، پێویــستی بــەکارهێنانی پێنووسمان بۆ دەردەکەوێت، ئەو پێنووسە هاوبەشەی کە پـەروەردگار هەمووماني پێ فێر کردووە و کردویەتی بە ئامراز و هۆکارێك بۆ فێربوون و ئــاڵوگۆڕکردنی زانیــاری و گەشــەپێدانی و گواســتنەوەی لــە نێــوان گەلاندا، پاشان هەر شتێکی دیکەش کە خوای پەروەردگار دەیبەخـشێ بە مرۆڤ لەو شتانەی عەقڵەکان وا لێدەکات پەی پێ بەرن، لە ئەفرانـدن و داهینان و دەرهێنان، لەو شـتانەی دەکەوێتـە ژێـر ئـەو فەرمایـشتەی پەروەردگار کە دەفەرمووێت: **{عَلَّمَ الْإِنْسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ}**. (العلق:٥)

**مانای: مرۆڤی فێری ئەو شتانە کرد کە نەیدەزانی.**

کەواتە دوو سەرچاوە هەیە بۆ فێربونی مرۆڤەکان ـ هەرگیز بێتاقـەت نابین لە جەختکردنەوە لەسەر لە یەکدی جودانەبوونـەوەیان ـ ئـەو دوو سەرچاوەیە یەکانگیر دەبن لەسەر تێـڕوانینی ژیاریانـە بـۆ هەسـتان بـە ئەرکی ئاوەدانکردنەوەو جێنشینی لەم گەردوونەدا، بۆیە پێویستە مرۆڤ ئــەم دوو سەرچـاوەیە بەیەکـەوە گـرێ بـدات و بێئاگـا نـەبێت لـە هـیچ یــەکێکیان، قورئــانی پــیرۆز و مانــا باڵاکــانی تێبگــات بــەهۆی بــوون و بوونەوەران و ئەو سـووننەت و یاسـا ڕێکوپێکانـەی خـوای پـەروەردگار دایناون بۆ جوڵەیان وجوڵەی ئەوەی تیایاندایە و جوان لە گەردوون ورد

ببێتـەوە بـەهۆی نـوور و ڕێنمـایی قورئـانی پـیرۆزەوە ڕێگـەی ڕاسـت و دروست بدۆزێتەوە بۆ بەجێگەیاندنی کاری جێنشینی و ئاوەدانکردنـەوە و هەستان بە داخوازییەکانی ئەو ئەمانەتەی کە لەسەر شانی دانراوە.

پێویستیشە هەردوو سەرچاوەکە بەیەکـەوە بخوێنرێنـەوە و فـەرمان بە هەردوو خوێندنەوەکە وەك یەك و بەیەکەوە بکرێن:

خویندنەوەی ئەو سرووشەی پەروەدگار ناردوویەتە خوارەوە کە خـۆی دەبینێتـەوە لـەو قورئانـە پـیرۆزەی مەبەسـت و مـەرامی پـەروەردگاری دیـارییکردووە لـە دروسـتکردنی بوونـەوەران و ئـەو سـوونەت و یاسـا ڕێکوپێکانـەی پـەروەردگار بـۆ جوڵـەی بـوون و بوونـەوەران تیایـدا ڕوونیکردووەتـەوە، سـەرەڕای ئـەو شـەریعەت و بەرنامـە و ڕاسـتیە بنەڕەتییانەی کە لە خـۆی گرتـووەو مرۆڤایـەتی هەمیـشە پێویـستی پێـی دەبێت. هەروەها خوێندنەوەی گـەردوون و ئاسـۆکانی و دەروونـی مـرۆڤ و ئەوەی بەکەڵکی دێت و ئـەوەی زەرەری لێـدەدات و ژینگـە و سرووشـت و ئەوەی گەشەی پێدەدات و ئەوەی تێکی دەدات.

## هەڵە و نەرێنییەکانی خوێندنەوە تاکەکەسییەکان

لـەوەی کـە لـە پێـشەوە باسمـان کـرد بۆمـان ڕوون دەبێتـەوە کـە خوێندنەوەی هەریەك لە سـرووش (وحـي) و گـەردوون دوو شـتن خـوای گەورە پێویستی کردوون، چونکە هەردووکیان بـە دوو فـەرمان هـاتوون کـە هـەموو خاسـیەت و مەرجـەکانی فەرمانـە شـەرعیە پێویـستەکانی دیکەیان تێدا هاتووەتەدی.

## پشتگوێخستنی خوێندنەوەی یەکەم:

کەسێك، خویندنەوەی یەکەم، کە بریتی بوو لەو سرووشەی (وحي) کە پەروەردگار بۆ پێغەمبەرانی ناردووە پشتگوێ بخات و باز بدات بەسەریدا و بەشێوەیەکی هەمەلایەنە لە خوێندنەوەی دووهەم، قوولّ ببێتەوە کە خۆی لە زانستە گەردوونییەکان و سرووشتدا دەبینیەوە، بەبێ گەڕانەوە بۆ لای پەروەردگار، ئەوکاتە پەیوەندی لەگەڵ پەروەردگاردا دەپچڕێت و بێئاگا دەبێت لە شتە پەنهانەکان (الغيبيات) و بە فەلسەفەی مرۆڤانەی دەستکرد و پچڕاو لە خوای گەورەو ڕێنماییەکانی ڕێ دەکات و بە یەك چاوی و دوور لە سەرچاوە تەواوەکانی فەلسەفە هەوڵ دەدات بە ڕەهایی مرۆڤ و سرووشتەکەی یەکبخات و وا دەڕوانێتە دروستکەر و هەموو شتە پەنهانەکان کە شتی لاوەکی و پشتگوێخراون (ماورائيات)، یان (میتافیزیقا)ـن و پشتگوێیان دەخات و پێیوادەبێت دەکرێت خۆی لێ گێل بکرێت و بەسەریاندا تێپەڕ ببێت. ئەگەر هێزیکی پەنهانیش هەبێت کاری دروستکردن و بەدیهینانی ئەنجامدابێت، ئەوە دەکرێت بە هێزی کەڕەتی یەکەمین ئەنجامی دابێت، پاشان لەبیری خۆی بردبێتەوە، یان لە بیری چووبێتەوە، پاشان بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی گەردوون بۆ خۆی بوو بە بکەر و کاریگەر و

کـارتێکراو، هــەروەك لەکۆنـدا ئەمــە ڕای ئەرســتۆ[1]بــووە، لــە نوێـشدا نیوتن[2] و هەندێکی دیکە ڕایان وایە.

کـاتێکیش هەنـدێك لــەو فەیلەسـووفانە پێیــان خــۆش بــوو بــیر لــە بەدیهێنـەر ـ جل شأنە ـ بکەنەوە، ئەوا بە بیردۆزی توانەوە (حلول) بیری لێ دەکەنەوە، بە شێوەیەك وا گومان دەبەن کە بەدیهێنـەر لەنێو خودی هێزە سرووشتیەکاندا جێگیر بـووە و بەتــەواوەتی تیایانـدا تواوەتــەوە، هەنـدێك ئەڵتــەرناتیڤی دیکــە دادەنــێن لــەجیاتی ئــەو لــە ئاڕاسـتەکانی گەشەکردن لە ڕێگەی تایبەتمەندییە ماددییە ئاڵۆزەکان، بۆ ئەوەی مرۆڤ هەست بە چوونە نێویەکی تەواوەتی بکات لەگەڵ سرووشت، بەو پێیەی کە ئەو بوونەوەرێکی سرووشتییە.

ئەوکات لێرەوە مرۆڤ لەناخیـدا دەسـتدەکات بـە هەسـتکردن بـە بـێ نیازبوونی، یان داخوازی بێنیـازبوونی لـە بەدیهێنەرەکـەی ـ جـل شـأنە ـ چــونکە ئــیتر وای لێــدێت بێجگــە لــە سرووشــت هــیچ شــتێکی دیکــە لەبــەردەمی نابینێـت، سرووشــت بەلایــەوە دەبێتــە هــەموو شــتێك، وا

---

([1]) ئەرســتۆ: فەیلەســووف و زانایــەکی نــاوداری یۆنانیــە، لــە گــەورەترین و گــرنگترینی فەیلەسووفە کۆنەکانی یۆنان هەژمار دەکرێت، فەیلەسووفە موسوڵمانەکان ســەرجەم کەلــەپوورە فەلسەفی و لۆژیکیــەکان ئەرسـتۆیان وەرگێـڕاوە و زۆرێکیــان ســەریان ســوڕماوە لێــی، هــەتا بــە "مامۆستای یەکەم" ناوزەدیان کردووە، (٣٨٤ـ٣٢٢ پ.م).

(٢) نیوتن، ئیسحاق: زانایەکی فیزیـای ئیگلیـزە، خـاوەنی یاسـای هێـزی کێـشکردنی گـشتی (الجاذبیة العام) و یاساکانی جوڵەیە (١٦٤٢ـ١٧٢٧ م).

دەزانێت سرووشت لەپشت هەموو شتەکانەوەیە، ئاشکراشە مرۆڤیش توانای هەیە زاڵ بێت بەسەر سرووشتدا بە زانست و زانیاری، ئەوەش نابینێت کە سرووشت و بوونەوەر هەمووی بە توانا و یاسا و سوونەتەکانی خوای گەورە ڕاوەستاوە و ڕەخسێنراوە، بەڵکو وا دەبینێت گەردوونێکی سەربەخۆ و بێ بەڕێوەبەرەو درێژبوونەوەو بەردەوامبوونێکی پەنهان و نادیاری هەیە، بەڵێ، ئەوکات هەست بەوە ناکات خوای گەورە ڕەخساندویەتی بۆی و تەنها ئەوە هەردووکیانی دروستکردووە، بەڵکو وا دەزانێت مرۆڤ دروستکەر و بەدێهینەرە، چونکە ئەو تواناکانی هەمەچەشنن و بە زانست و تواناکانی زاڵە بەسەر سرووشتدا و ئەو تەقێنەرەوەی نهێنیەکانی ناویەتی، بەمەش لادان و سەرلێشوانێکی ترسناك لە دید و بۆچوونیدا دروست دەبێت، چونکە ڕاستیەکە بەو شێوەیە نییە، بەڵکو گەردوون ڕەخسێنراوە بۆ مرۆڤ و مرۆڤیش چەندین توانای شاراوەی زیهنی و عەقڵی و زانستی، پێ بەخشراوە کە دەتوانێت بەهۆیانەوە گەردوون بۆ قازانجی خۆی بەکاربهێنێت، بۆ ئەوەی ئەمانەتی جێنشینی جێبەجێ بکات.

ئینجا کاتێك مرۆڤ بێئاگا دەبێت و خۆی کوێر دەکات لە بەرانبەر یاد و ڕێنماییەکانی خوای میهرەبان و بەهۆی پشتگوێخستنیەوە بۆ سرووش (وحي) توانا و دەسەڵاتی پەروەردگاری نەبینی، ئەو کاتە هەستکردنی بە بێنیازیی لە پەروەدگار و پشتبەستنی بە توانا و داهێنانەکانی خۆی ڕایدەکێشێت بەرەو ئەوەی پەیوەندییەکەی لەگەڵ گەردوون بکات بە

پەیوەندی زاڵبوون و ململانێ و خۆبەگەورەزانین و لەخۆباییبوون، نەك پەیوەندی جێنشینی، ئەوکاتە میلی (بوصلة) ڕێنمایی بزر دەکات و ئەو پەیوەندییە خۆشەویستیەی لە نێوان مرۆڤ و پێکهاتەکانی سرووشتدا هەیە لەدەستی دەدات، مرۆڤ ئەو هەستەی کە تیایدا چێنراوە ـ کە دروستکراوێکی جێنشینکراوەو ئەمینداره لە نێو هەموو گەردووندا ـ لەدەستی دەدات و ئەو هەستەی نامێنێت کە: هەموو ئەو شتانەی لە گەردووندان بۆ ئەو دروستکراون و ڕەخسێنراون و ملکەچ و ڕام کراون، هەردووکیشیان وەك یەکن لەوەدا کە بەندەو دروستکراوی پەروەردگارن. خوای گەورە دەفەرموویت: **{واللَّهُ خَلَقَكُمْ ومَا تَعْمَلُونَ}.(الصافات: ٩٦)** مانای: خوای گەورە ئێوەو ئەو کردارانەشی دروستکردووە کە ئەنجامیان دەدەن.

کە ئەم هەست و بیرکردنەوەی لەدەستدا، ئەوکاتە بوون لە دید و بۆچوونیدا لەسەر شێوەی چەند هێزێکی دژبەیەك و ناکۆك وێنا دەبن، ئەو مرۆڤە بێئاگایە لەناخی خۆیدا هەوا و حەز و ئارەزووەکانی بە شێوەی خوایەك دادەتاشێ و ئەوانی لێ دەبن بە خوا و وا خەیاڵ دەبات کە پێویستە تەنها بەهاکان لەخودی خۆی و لە سرووشت وەربگرێت، خودی ئایین و باوەڕ جاری وا هەیە لە ئەنجامی ئەم خوێندنەوە کوێرانەیە دەبن بە ئامرازێك، هەرکەسێك بیەوێت لە هەرکاتێکدا، بۆ بەدەمەوەچوونی حەزەکانیان و خزمەتی خۆیان بەکاریاندەهێنن، بۆیە

لێـرەدا مـرۆڤ ئـەو فەرمایـشتەی پـەروەردگاری لـێ دێتـە جـێ کـە دەفەرموویێت: **{كَلاَّ إِنَّ الْإِنْسَانَ لَيَطْغَى (٦) أَنْ رَآهُ اسْتَغْنَى}**. (العلق: ٦، ٧)

مانای: نەخێر، مرۆڤ ـ لەگەڵ ئەو هـەموو چـاکەیەی لەگـەڵی کـراوە ـ یاخی دەبێت و ستەم دەکات، کە کاتێـك خـۆی بـینی دەوڵەمەنـد و بـێ نیازە.

ئـەو کاتـە دەکەوێتـە سـتـەم و زۆرداریـی لـە مرۆڤـەکانی بـرای، لـە ئـــەنجامی کـــرداری مرۆڤـــەکان، ڕووداوە ژینگەییـــەکان ڕوودەدەن و پیسبوون و تێکچوون لە وشکانی و دەریا و هەوا پەیدا دەبێت و یاسـای هاوسەنگی تێکدەچێت و نەخۆشییەکانی لادان و تاکڕەوی و (شذوذ) لـە گەردووندا بڵاودەبنەوە، هەندێك لە کیشوەرەکان برسیەتی و کاولکـاری دایانـــدەگرێت و هەندێکیـــشیان نەخۆشـــیی تـــاوانکردن بەهـــەموو جۆرەکانیـــەوە تیایانـــدا بڵاودەبێتـــەوە و ژیـــانێکی تـــاڵ و نائـــارام دایاندەگرێت، خوای گەورە دەفەرموویێت: **{وَمَنْ أَعْرَضَ عَنْ ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنْكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى}**. (طه: ١٢٤)

مانای: هەرکەسـێك ڕوو وەربگێڕێـت لـە بەرنامـە و یـادی مـن، ئـەوە بێگومان گوزەرانێکی سەخت و تەنگی دەبێت.

هەنـدێك جـار ئـەو بێئاگایانـە لـە یـادی خـوای میهرەبـان قەناعـەت بـەخۆیان دەهێـنن بـەوەی کـە دەڵـێن: ئـەوەی کـە ڕوودەدات بـاجێکی ئاساییە و ناتوانین خۆمانی لێ دەرباز بکەین و پێویستە ـ ئەو کەسانەی دەیانـەوێت لـەززەت لـە بەخشـشە شارسـتانیەکان وەربگـرن ـ بەرگـەی

بگرن و نرخی گرانی ئەوە بدەن، بەڵام پێویستە بزانن ئـەوە فێڵێکـە لـە خۆیانی دەکەن و قسەیەکی بریقەداری بێ نێوەڕۆك و بێ مانایە، چونکە ئـەو ئاوەدانکردنەوەیـەی خـودا پێـی ڕازیـە و داوای لـە مـرۆڤ کـردووە تێکـڕای بـەها بـەرزەکانی بـەدیبهێنێت، وەك: ڕاسـتی و خێـر و جـوانی دەبێـت تیایـدا بەرجەسـتە و باڵادەسـت بێـت، ئەگـەر هەنـدێك شـتی لاوەکـیش ڕووبـدات، ئـەوا بـە یارمـەتی خـوا و ڕێنماییـەکانی دەکرێـت سنووردار بکرێت و کاریگەرییەکانی لابـبرێن، چـونکە ئاوەدانکردنـەوەی دروسـت و ڕێکوپێـك و بـێ زەرەر و زیـان و گـشتگیر بـۆ گـەردوون لـە گەڕانــەوە بــۆ لای پــەروەدگار و ڕێنماییــەکانی لــەم بــوارەدا، جــودا نابێتەوە.

## پشتگوێخستنی خویندنەوەی دووهەم:

پشتگوێخــستنی خوێندنـــەوەی دووهـــەمیش کـــە خوێندنـــەوەو وردبوونەوەیە لەم گەردوون و سرووشتە ڕێکوپێکەی پەروەردگار بۆمانی رەخساندوویەتی و بەدیهێناوە، بەشێوەیەك کـە تـەنها سـرووش (وحـي) بخوێنیتەوەو خۆت دابـبڕی لـە چـواردەور و بـوون و بوونـەوەران، ئـەوە سەردەکێشێت بۆ ڕقبوونەوە لە دنیا و ئەوەی کە تیایدایە و بەناشـیرین تەماشـاکردنیان، ئەوکاتــەش کــاری ئاوەدانکردنــەوە و بەجێگەیانــدنی ئەمانەت و ئەرکی جێنشینی پەکی دەکەوێت و وای لێدێت مرۆڤ سوود لە ڕەخـساندن و ڕامکردنـی نیعمەتـەکان نـەبینێت و هـزر و بیرکردنـەوەی

پەکدەخات و کارەکانی بەکەم تەماشا دەکات، بەڵکو جاری وا هەیە وای لێدێت نکوڵی لە کار و کاریگەرییەکانی خۆی بکات لەم ژیانەدا و وا دەزانێت ئەو هیچ کارێك بۆ خۆی ئەنجام نادات و لە بوونی خۆیدا هیچ مانایەکی ئاوەدانکەرەوەیی گەردوون نابینێت، هەموو ئەم بۆچوون و بیرکردنەوانەش بە تەواوی پێچەوانەی بەرنامە و مانا بەرزەکانی قورئانی پیرۆزن.

هەروەها بازدان بەسەر خوێندنەوەی دووهەم کە خویندنەوەی گەردوونەو پشتگوێخستنی، یان کۆنەکردنەوەی لەگەڵ خوێندنەوەی یەکەم، دەبێتە هۆی دەستەوەستانبوونی مرۆڤ لە ڕووی شارستانیەوەو پەککەوتنی تواناکانی و تێکەڵکردنێکی خراپ و سەرسوڕهێنەریش لەنێوان بابەتەکانی جیهانی پەنهانی و جیهانی بەرچاو و ئاشکرا ڕوودەدات، وەك پێشتر باسمانکرد.

جاری وا هەیە ئەوانەی خوێندنەوەی یەکەمیان - خوێندنەوەی سرووش (وحي) بە تەنها - پشتگوێ خستووە وا گومان دەبەن کە بەپاکڕاگرتنی خوا - جل شأنە - لە کەموکوڕی تەواو نایەتەدی تا ئەوکاتەی نرخی کاری مرۆڤەکان پوچەڵ نەکرێتەوەو نکوڵی نەکرێت لە هەموو ویست و بژاردەکانی و ڕۆڵ و کارامەییەکانی لێ دانەماڵرێت، بە شێوەیەکی ئایینگەراییانە (لاهوتی)و کەشیشەییانە (کەنەهوتی)، وا دەزانن ئەوان هیچ بژاردەو هەڵبژاردنێکیان نییە بۆ کارەکانیان و هەموو شتێکیان بە زۆرو بەبێ ئارەزووی خۆیان پێ ئەنجام دەدرێت، بەمەش

ڕۆڵـی جێنـشینی و ئاوەدانکـەرەوە لەدەسـت دەدەن و تواناکانیـان بـە تەواوی سفر دەبێت و بە ڕەهایی دەستەوەستان دەبن، هەندێك جاریش ڕەنگە بکەونە نێو حەرامەکانەوە و حەرامەکان ئەنجام بدەن، بە بەڵگەی ئەوەی ئەوان هیچ شتێکیان بەدەست نییـە و لـە چـارەیان نووسـراوە و پێیـان ئـەنجام دەدرێـت، ئەمـەش خاسـیەتێکە لـە خاسـیەتەکانی هاوبەشدانەران (المشركين).[1]

ئـەوەی بڕوانێـت بـۆ سەرچـاوەکانی گرووپـە ئیـسلامیەکان (الفـرق الإسلامية) و قسە و قسەڵۆکی موسوڵمانان لە ڕابـردوودا، لـەم بارەیـەوە شتی سـەیرو سـەمەرە دەبینێـت لـە بابەتـەکانی تێکـەڵکردنی ویـست و کارەکانی خواو ویست و کاری مرۆڤەکان و بابەتەکانی هەڵبژاردن و هۆ و

---

([1]) ئەمە ئاماژەیە بۆ فەرمایشتی پەروەدگار کە دەفەرمووێ: {سَيَقُولُ الَّذِينَ أَشْرَكُوا لَوْ شَاءَ اللَّهُ مَا أَشْرَكْنَا وَلَا آبَاؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِنْ شَيْءٍ كَذَلِكَ كَذَّبَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ حَتَّى ذَاقُوا بَأْسَنَا قُلْ هَلْ عِنْدَكُمْ مِنْ عِلْمٍ فَتُخْرِجُوهُ لَنَا إِنْ تَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَإِنْ أَنْتُمْ إِلَّا تَخْرُصُونَ}**(الأنعام: ١٤٨)**.

مانای: لەمەودوا هاوبەشداران دەڵێن: ئەگەر خوا بیویستایە هاوەڵمـان بـۆ بڕیـار نـەدەدا!! و باوباپیرانیشمان هاوبەشدانەر (مشرك)، نەدەبوون و هیچ شتێکمان لە خۆمان حەرام نـەدەکرد!! هەر بەو شێوەیەش ئەوانەی پێش ئەمانیش درۆ و بوختانیان هەڵدەبەست، هـەتا تووشـی بـەڵای ئێمە بوون و سزای ئێمەیان چەشت، پێیان بڵێ: ئایا هیچ زانیاری و زانستیەکی خواییتـان لەلایـە تا نیشانمان بدەن و بۆمان دەربخەن؟ ئێوە شوێنی هیچ شتێکی دیکە ناکەون جگـە لـە گومـان، ئێوە هیچ شتێکی تر ناکەن مەگەر ئەوە نەبێت کە درۆ دەکەن.

هۆكارەكان و. . هتد كە بـووە هـۆی شـلۆقی و تێكـچوون و لێڵبـوونێكی زۆر لەنێو یاسای مەعریفی ئیسلامی.

كەواتە، پێویستە هەردوو خوێندنەوەكە كۆبكرێنـەوە: خوێندنـەوەی سرووش (وحي) و خوێندنەوەی بوون (وجود)، پێویستیشە عەقڵی مرۆڤ لەسەر هەردووكیان ـ پێكەوەـ بنیادبنرێت، بۆ ئەوەی نەكەوێتە نێو هیچ یەك لەو دوو لایەنە خراپەی باسمان كردن.

## پرۆگرامسازی مەعریفیی قورئانی پیرۆز

لێــرەدا ئــەوەمان بــۆ دەردەكــەوێت كــە ئــەوەی ناوماننــاوە ((پرۆگرامسازی مەعریفیی قورئانی پـیرۆز))[1] كۆڵەكەیـەكی سـەرەكییە بۆ كۆكردنەوە لە نێوان هەردوو خوێندنەوەكە و زەرورەتێكی مەعریفی و

---

([1]) مەبەستمان بە (بەرنامەی قورئانی مەعریفیی) ئەو بەرنامەیەیە كە قورئانی پیرۆز لە سەر شێوەی چەند شتێكی دیار و سنووردار (محددات) و لە سەر شێوەی چـەند یاسـا و سـووننەتێك كە دەكرێت هەڵبهێنجرێن لە ئەنجامی گەڕان لـە نێـو ئایەتـەكانی قورئـانی پـیرۆز و لـە ئـەنجامی خوێندنەوەو وردبوونەوە لێیـان و بیرلێكردنـەوەیان و دابەزانـدنیان لەسـەر واقـع، پێـشكەشمانی دەكات، پاشان مامەڵە كردن لەگەڵ ئەو شتە دیار و سنووردارانە بە مامەڵـەكردنێك كـە رێگـەمان پێبدات بیانكەین بە شتی راست و بەڵگەنەویست و زاڵبوو بەسەر هەموو گومان و هەموو هەنگاوە مەعریفیەكانمانی پـێ رێكبخـەین، لەوانـەش راسـتكردنەوەی رێـرەوی زانـستییمان و دەرهێنـانی فەلـسەفەی زانـستە سرووشـتی و كۆمەڵایەتیـەكان لـەو كۆتاییـە تەسـكانەی كـە ئێـستا لێـی راوەسـتاون. لـە پێـشەكی ئـەو شـتە دیـارو سـنوردارانەش بابـەتی (كۆكردنـەوەی هـەردوو خویندنەوەكەیە) كە باسمان كرد و (یەكێتی بینای نێو هەموو ئایەتەكانی قورئان)و... هتدن.

ژیارییە، نەك تەنها لەسەر ئاستی ئایینی ئیسلام بەتەنها، بەڵكو لەسەر ئاستی جیهانی - بەگشتی - بۆ دەرچوون لەو تەنگ و چەڵەمە مەعریفییە[1] و ئەو قەیرانە فیكرییە جیهانییەی لەم سەردەمەدا مرۆڤایەتی تێیكەوتووە[2]، چونكە دوای قۆرخكردنی ڕەهەندەكانی بەرنامەسازی لە بیركردنەوەدا لەلایەن ڕۆژئاواوە، فیكری ڕۆژئاوایی و شارستانیەتەكەیان ڕووبەڕووی كێشەی گەورەی دیارییكردنی داڕشتنی ڕاست و بەرنامەدار بۆ هزری خودی خۆیان بوونەوەو نەیانزانی چۆن داڕشتنەوەیەكی بۆ بكەن كە پشتبەستوو بێت بەو پێشكەوتنە زانستییەی لە هەموو ڕووەكانەوە بەدەستیانهێناوە و تائێستا نەیانتوانیوە شتێكی وا بكەن دەردەكانیان لەم ڕووەوە دەرمان بكات و توونیەتیان بۆ ڕاستییەكان لەم بوارەدا، بشكێت.

ڕاستە ماركسیەت هەستا لە هەوڵێكیدا بۆ ئەم داڕشتنەوەیە لە چوارچێوەی (المادیة الجدلیة)[3]، بەڵام ماركسیەت و فیكرەكەشی بە

---

([1]) ئەو چەڵەمە مەعریفییەی بەرنامەكان و مەعریفە وەك یەك كەوتوونەتە ناوی، چونكە قەیرانی بەرنامە و فەلسەفەی زانستە سرووشتی و كۆمەڵایەتییەكان وای لێهاتووە خەوی زاناكانیانی زڕاندووە.

([2]) چونكە قەیرانە هزرییەكان بەجۆرێكی وا گەورە بوون كە بەرنامە مرۆییەكان لەتواناایاندا نەماوە چارەسەریان بۆ بدۆزنەوە، وەك شاراوە نییە لەو كەسانەی لە سەردەمی ئیمڕۆماندا كە چاودێری ڕووداوەكان دەكەن.

([3]) المادیة الجدلیة: پایەیەكی سەرەكییە لە فەلسەفەی ماركسیەت و پشتی بە یاسا دیالێكتیكیەكان بەستووە، كە بە كورتی مەبەست لێی ئەوەیە: فیكر لە دەرئەنجامی ماددەیە و

دارِمانی یەکێتی سۆڤیەت دارِمان، پێش ئەوەی ڕۆژئـاوا جێگرەوەیـەکی مەعریفی و مەنهەجی بۆ بدۆزێتەوە، بۆیـە شارسـتانیەتی ڕۆژئـاوایی بـێ دارِشتنەوەیەکی فەلسەفی جێگرەوە مایەوە فەلسەفەیەکی وا کەبتوانێت جوڵانــەوەکانی ڕێکبخــات و کێــشەکانی فراوانبــوون و پێــشکەوتنەکان لەخۆبگرێت و چارەسەریان بکات و وایان لێبکات توانای ئەوەی هــەبێت وەڵامی پرسیارە هەڵپەسێرراوە کۆتاییەکان پێشکەش بکات کە زانایانی ئەم سەردەمە ڕوویان وەردەگێرِن لە وەڵامدانەوەیان و دەستەوەسـتانن لەبەردەم بەدواداچوونیاندا، بۆیە شارستانیەتی ڕۆژئاوا پەنای بردووەتە بەر دروستکردنی قەیرانەکان بۆ ئەوەی پارێزگاری لـە دڵـەڕاوکێی خـۆی بکــات، لەبــەر ئــەوەی ئــەم دڵەڕاوکێیــەی گــرنگترین ڕیگــەکانی پارێزگاریکردنیەتی لە پارچە پارچـە بـوون، بـەڵام قەیرانەکـەی ئێمـەی عەرەب و موسوڵمانان زۆر قـوڵ و بەسـۆترە، چـونکە ئێمـە لەلایەکـەوە هاوبەشـین لـە قەیرانـە جیهانییـەکان، لەبـەر ئـەوەی پەیوەنـدییمان بـە جیهانـەوە وەك جـاران پـەیوەندییـەکی لاوەکـی نـەماوە - وەك هەنـدێك پێیانوایە-، چـونکە شارسـتانیەتی هاوچـەرخ تـوانی لـە ڕێگـەی ئـەو داگیرکارییــە فیکــری (غزوهــا الفکــري) و ڕۆشــنبیرییە دامەزراوەییــەی ســەرکەوتوو بێــت لــەوەدا کــە بەرنامــە و تێرِوانینــە زانــستییەکانی و

---

ماددە لە بوونەوەردا هەمیشە لە جوڵەدایە و هەرگیز فەوتانی بەسـەردا نایـەت، بـەڵکو تـەنها لـە شێوەیەك دەگۆڕێت بۆ شێوەیەکی دیکە و پێیوانیە ماددە لە نەبوو دروستکرابێت... . (وەرگێڕ)

تێگەیشتنەکانی بۆ بوون و جوڵانەوەی گەردوونیی فەرز بکات، هەروەك چۆن تێڕوانینەکەی خۆی بۆ میژوو زانست و مەعریفە و شارستانیەت و ڕۆشنبیری و پێشکەوتن و دواکەتن. . . هتد، بەسەر هەمواندا فەرز کرد، کەواتە ڕاستی ئەو (بەرنامە قورئانییە) چیە کە بۆ چارەسەرکردنی قەیرانە مەعریفی و فیکرییەکانی خۆمان و جیهان، پێشنیازی دەکەین؟

## محددات و معالم

محدداتەکانی ((بەرنامەی قورئانی مەعریفیی)) دەردەکەوێت و ڕوون دەبێتەوە لە دەرەنجامی خوێندنەوەی هەردوو کتێبەکانەوە ـ قورئان و گەردوون ـــ، هەروەها لەسەر بەرانبەرپێکردنیان و دەرخستنی ئەو یەکدی تەواوکاری و کاریگەربوونەی لە نێوانیاندا هەیە و زەقکردنەوەی ئەو بەرنامەڕێژییەی کە بۆ توێژینەوەو خستنەڕووی ڕاستیەکان، هەیانە، دادەمەزرێت:

**کتێبی یەکەم**: بریتیە لە کتێبی سرووشی خوێنراوە، مەبەستیشمان پێی قورئانی پیرۆزە، چونکە تەنها ئەو کتێبێکی گەردوونی وەهایە کە بەرانبەر بە بوونی گەردوونی و جوڵانەوەکەی بێت و هەردووکیان لەخۆی بگرێت، ئەویش بەهۆی ئەو ڕەهەندە گەردوونییانەی کە تێیدایەتی.

کتێبی دووهەم: بریتیە لە کتێبی گەردوونیی جوڵاو کە گشت دیاردەکانی بوون دەگرێتەوە، چونکە قورئانی پیرۆز و گەردوونی قەشەنگی بەدیهێنراو، هەردووکیان بەڵگەن لەسەر یەکدی و هەریەکەیان

ئەوی دیکەیانی پێ دەدۆزرێتەوەو یەکدی بۆ یاسا و سوووننەتەکانیان یەکدی پەلکێش دەکەن، قورئانی پیرۆز مرۆڤ رادەکێشێت بۆ بیرکردنەوە لە گەردوون و شارەزای و ڕێنمایی دەکات کە چۆن ڕۆڵی خۆی لەم گەردوونەدا ببینێت، لە چەندین ڕووەوە هەڵیدەسوڕێنێت بۆ ئەوەی سوود لە پێکهاتەکانی گەردوون وەربگرێت و رامیان بکات بۆ خۆی و داخوازییەکانی بوون و بوونەوەران لە گەردوون جێبەجێ بکات، هەروەها گەردوونیش مرۆڤ ڕادەکێشێت بەرەو قورئان بۆ ئەوەی پرسیارەکانی ئاڕاستەی بکات و داوای ڕێنمایی لێ بکات بۆ چۆنیەتی مامەڵکردن لەگەڵیدا و سودوەرگرتن لێی. کەواتە مەبەستمان لە دەستەواژەی (کۆکردنەوە لە نێوان هەردوو خوێندنەوەکە) بریتی بوو لە زانینی ئەم مانایانە و وردبوونەوە لێیان و کارپێکردنیان، بەشێوەیەك کە لە سەرەتاوە خوێندنەوەیەکی وابێت بە پەنهانی خۆی نیشان بدات، لە چوارچێوەی سرووش (وحي) دەستپێبکات و پاشان بەرەو ڕووی گەردوون بڕوات. خوێندنەوەیەکی بابەتییانەی وابێت کە لە گەردوون و پێکهاتەکانیەوە بەرەو خوێندنەوەی سرووش (وحي) بڕوات، چونکە خوێندنەوەی سرووش (وحي) وەك دابەزینە لە ئاستی گشتی (كلي) بۆ ئاستی بەشیی (جزئي)، جا بە ئەندازەی ڕێگەپێدراو لە توانا ڕیژەییەکانی تێگەیشتنی مرۆڤ بۆ ئەو دابەزینانە لە ئاستی گشتی (كلي) و چۆنیەتیەکانی.

خوێندنەوەی گەردوونیش ئەو پرسیار و بابەت و مەسەلە بەشییانە (جزئي) پێشکەش دەکات و بەرزیان دەکاتەوە بۆ دەروازەو دەرگانەی سرووش (وحي)، بۆ ئەوەی خوێنەری هەردووکیان وەڵامی دروستی لەو سەرچاوە بێگەردەی کە ڕێنمایی هەمووان دەکات بۆ باشترین ڕێگە و وەڵام دەستبکەوێت.

ئەوکاتە بۆ مرۆڤی خوێنەر مشتومڕی پەیوەندی لە نێوان هەردوو سەرچاوەکە ـ سرووش و گەردوون – ڕوون دەبێتەوە، یان پەیوەندی لە نێوان (تێگەیشتنی تەواوکاری ئاڵوگوڕ) و مشتومڕ و کارلێك و کاریگەربوون لە نێوانیاندا، بە ڕوونترین شێوە دەردەکەوێت.

## ڕۆڵی خوێندنەوەی فەرمووده ( السنه )

لێرەوە پێویستیی ڕۆڵی خوێندنەوەی فەرموودە و ژیاننامەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) بەشێوەیەکی گشتی ڕوون دەبێتەوە، ئەوکاتە خوێندنەوەی گەردوون وەك تێڕوانین و بەرزبوونەوە لە بەشیی (جزئي)ـەوە بەرەو ڕووی گشتی کە خۆی لە سرووش (وحي) و جێبەجێکردنەکانی (تطبيقات) پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) بۆ ئەو سرووشە دەبینێتەوە، هەموو ئەمانە بەگوێرەی توانا ڕێژەییەکانی تێگەیشتنی بۆ دیاردەکان دەخوێنێتەوە، ئەوکاتە لەیەکدی جیابوونەوە لە نێوان دەرئەنجامەکانی سرووش و ئەنجامەکانی زانستە بابەتییەکان ڕوونادات، وەك گومان دەبرێت، هەڵبەت ئەگەر سوونەت و ژیاننامەکەی بە تێگەیشتنێکی ورد لەو چواچێوەیەدا بخوێنرێتەوە.

لەگەڵ تێگەیشتنی سوونەت و ژیاننامەی پێغەمبەر ( دروودی خوای لەسەر بێت) بەشێوەیەکی گشتی و کۆکردنەوەیان لەگەڵ قورئانی پیرۆز لـە ڕێگەمانـدا بـۆ (کۆکردنـەوەی هـەردوو خوێندنەوەکـە) پێویـستیمان بەوەیە بزانین کە ((. . . قورئـانی پـیرۆز، ڕۆحـی ئـەمین (جوبریـل) بـۆ سەر دڵـی پێغەمبـەر (درودی خـوا لەسـەر خـۆی و بنەماڵەکـەی بێـت) هێناویـەتی، خـوای گـەورە دەفـەرموویت: {وإِنَّـهُ لَتَنْزِيـلُ رَبِّ الْعَـالَمِينَ (١٩٢) نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الآمِينُ (١٩٣) عَلَى قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِـنَ الْمُنْـذِرِينَ (١٩٤) بِلِسَانٍ عَرَبِيّ مُبِينٍ (١٩٥)}. (الشعراء:١٩٢ـ١٩٥)

مانای: بەڕاستی ئەم قورئانە لە لایـەن پـەروەردگاری جیهانەکانـەوە ڕەوانە کراوە، جوبرەئیلی ئەمین (فریشتەی وەحـی) دایبەزانـدووە، بـۆ سەر دڵی تۆ ئەی محەممەد، تا بچیتە ڕیزی ئەو کەسانەوە کـە خـەڵکی بێـدار دەکەنـەوە و لـە خـەوی غەفڵـەت ڕایاندەچڵەکێنن، بـە زمـانێکی عەرەبی ڕوون و ئاشکرا، یاخود بە زمانێکی پاراو و شیرین و ڕوون.

کەواتە هاتنە خوارەوەکەی بۆ سەر دڵ بوو، بۆیە هەر لـە سـەرەتای دابەزینی قورئان ڕێگری لێکرا کە لە کاتی هاتنی سـرووش بـۆی، زمـانی خۆی بجوڵێنێت، خوای گەورە دەفەرموویت: {لاَ تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِ (١٦) إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُ وقرأنهُ (١٧) فَإِذَا قرأنـاهُ فَـاتَّبِعْ قرأنـهُ (١٨)}. (القيامة: ١٦ـ١٨)

مانای: پەلـە مەکـە و زمانـت مەجوڵێنـە بـۆ ئـەوەی پەلـە بکـەی لـە وەرگرتنیدا، بەڕاستی لەسـەر ئێمەیـە کۆکردنـەوە و خوێندنـەوەی، جـا

کاتێـك ئێمـە دەیخوێنینـەوە تـۆش لـە خوێنەوەیـدا شـوێنمان بکـەوە. ئـەوەی بـۆ سـەر دڵـیش بێتـە خـوارەوە مەبەسـت پێـی تێگەیـشتن و وردبوونەوەیە لێی و وەرگرتن و جێگیربوونە لەنێویدا، بۆیە ئەو کەسەی قورئـانی پـیرۆز دەخوێنێتـەوە ئەگـەر بیـەوێت جـوان تێبگـات لـەوەی دەیخوێنێتەوە و ماناکانی وەربگرێت و مەبەستی خـوای گـەورەی تیـادا بدۆزێتەوە، پێویـستە دابیەزێنێتـە سـەر دڵ و دەروونـی و ماناکـانی بـە عەقڵی بخوێنێتەوە. هـەروەها ئەگـەر بیـەوێت بگاتـە ئاسـتی خوێنـەری تەواوی قورئانی پیرۆز، پێویستە بە هەستێکی وەهاوە بـچێتە خزمـەتی کە دڵنیا بێت لەوەی هەرچـی بیـەوێت لێـی دەسـتی دەکـەوێت، ئەگـەر دابیەزێنیتـە سـەر دڵ و دەروونـی و بـە باشـی بیخوێنێتـەوەو بـیری لێبکاتەوە و تێیبگات و لە ماناو مەبەستەکانی وردبێتەوە.

هەرکەسـێك سـوورەتێك لـە سـوورەتەکانی، یـان نـەجمێك لـە نەجمەکانی، یان ئایەتێك لـە ئایەتـەکانی بخوێنێتـەوە، ئـەوە دەلاقـەی لەیـەکتر جوداکردنـەوەی (الفرقـان) شـتەکانی بـۆ ئـەقڵ و ژیـری خـۆی کردووەتەوە لەسەر ئاسۆ فراوانەکەی قورئانی پیرۆز، بەڵام ئەو کەسەی بیخوێنێتـەوە و لـە خزمـەت هەموویـدا ڕابووەسـتێت لـە چوارچـێوەی یەکێتی بینای مانا و مەبەست و دەستەواژەکانی و لەو ڕووەوە کە کۆی ئایەتـەکانی بەهەموویانـەوە یـەك مانـا و مەبەسـتی گـەورە دەگەیـەنن، دیسانەوە بۆ ئەویش دەبێتە جیاکەرەوە (الفرقان).

فورقانیش مانایەکی گەورە و فراوانە، بەهۆیەوە مرۆڤ دەتوانێت چاك و خراپ، حەق و بەتاڵ، ڕاست و هەڵەلەیەکتری جودا بکاتەوە، جا ئـەو کەسەی قورئان بە جـوانی و بـە وردی و تێگەیـشتنەوە دەخوێنێتـەوە، هەموو ئەم توانا و هەستانەی بـۆ دروسـت دەبێـت و هــەر بـەم فورقانـە توانای ڕێککردنی کردار و گوفتار و جوڵە و خەیاڵ و هزر و نیەتەکانی و زۆربەی هەڵسوکەوتەکانی بۆ دروست دەبێت. کە ئـەم توانایـە بـۆ مـرۆڤ دروستبوو، پێی دەوترێت: "فەتوا لە دڵی خۆت وەربگرە با موفتیـەکان فەتواشت بۆ بدەن، کەواتە قورئان بەشێوەیەکی گشتی وەك (نموونـەی مەعریفــەی گــشتییە) بــۆ ئــەو کەســەی بــە وردی و بیرلێکردنــەوەوە بەهەمەلایەنە دەخوێنێتەوە".

لەنێو ئەو چوارچێوەیەدا دەتـوانین تێبگـەین لـە هۆکـاری بەتونـدی ڕێگرییکردنی پێغەمبەر (دروودی خوا لەسەر خۆی و بنەماڵەکـەی بێـت) لە سەرەتاوە لە هاوەڵە بەڕێزەکانی کە هیچ شـتێکی دیکـە بنووسـنەوە لەزاری ئەوەوە بێجگـە لـە قورئـان، دووپاتکردنـەوەی ئـەوەی کـە هــەر کەسـێك هــەر شـتێکی نووسـیوەتەوە بێجگـە لــە قورئــان، پێویـستە بیسڕێتەوە[1].

---

(1) پێغەمبەری خوا تەنها ڕێگری نەکرد لـە نووسـینەوەی فەرمایـشتەکانی خـۆی و ڕووداو و سـوونەتەکانی، بـەڵکو فـەرمانی کـرد بـە سـڕینەوەی ئـەوەی کـە نووسرابووشـەوە لـە غـەیری قورئان، لە فەرمایشت و ڕووداو و سوونەتەکان.

هەروەها هاوەڵانیشی لەدوای خۆی هەر وایان کرد، بەتایبەتی پێشەوایان ئەبوبەکر و عومەر (خوا لێیان رازی بێت) کە زۆر بەتوندی ڕێگریان دەکرد لە گێڕانەوەی فەرموودە. هەر کەسێکیش فەرموودەیەکی بۆ باسکردبان داوای ئەوەیان لێدەکرد یەکێك بهێنێت بۆ ئەوەی شاهێدی بدات بەوەی گوێی لە دەمی پێغەمبەر بووە (دروودی خوا لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی بێت) کە ئەو فەرمایشتەی فەرمووە، سووریش بوون لەسەر ئەوەی یەکێك بهێنێت پاڵپشتی بکات بۆ ئەو ڕیوایەتە، ئەمە وایکرد کە زۆرینەی هاوەڵان واز لە گێڕانەوەی فەرموودەکان بهێنن، بۆیە ئێمە زۆرێك لە بابەتە دووبارەبووەکان دەبینین کە کاتێك دەگێڕدرێنەوە، بە چەند شێوەیەك دەگێڕدرێنەوە، زۆر دووبارە دەبنەوە، کە دەکرا ئەوانە بە تەواتور نەقڵ، بکرێن، وەك: وشەکانی بانگ و قامەت و (بسم الله، حي على الصلاة)، يان (حي على خير العمل).

بەڵام لە سەردەمی عەبدولعەزیز (خوا لێی ڕازی بێت) لە ساڵی (٨٣ هـ)، پاشان لە سەردەمی کوڕەکەی، عومەری کوڕی عەبدولعەزیز (خوا لێی رازی بێت) ساڵی (٩٩هـ) خەڵکێکی زۆر ڕوویان کردە کۆکردنەوەی فەرموودەکان، ئەمەش لەبەر ئەوە بوو عومەری کوڕی عەبدولعەزیز (خوا لێی ڕازی بێت) پێیوابوو، گەر فەرموودە کۆبکرێتەوە و دابنرێت لەبەردەستی موسوڵماناندا، ئەوا فەرموودە دەبێتە جێگرەوەی ئەو جیاوازییە زۆرەی لە فیقهدا هەیە، چونکە پابەندکردن بە ڕیوایەت لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوا لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی بێت) بەهێزترە لە پابەندکردن بە تێگەیشتنی فەقیهەکان، ئەوە زیاتر کاریگەر دەبێت لە نەهێشتنی جیاوازی و کۆکردنەوەی ڕایەکان.

بەڵام ئایا بۆچی پێغەمبەر (دروودی خوا لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی بێت) ڕێگری لە نووسینەوەی هەرشتێك بێجگە لە قورئان، کرد، هەردوو هاوەڵەکەیشی ـ ئەبوبەکر و عومەر ـ لەوەدا شوێنی ئەو کەوتن؟! ئەمە لەبەر ئەوە بوو بۆ ئەوەی عەقڵی خەڵکی و دڵ و دەروونیان یەکەم جار لەسەر قورئانی پیرۆز پەروەردە ببێت و دابمەزرێت، قورئانی پیرۆز جێگیر ببێت تیایاندا، لەوێوە توانا مەعریفییەکانیان هەڵبقولێت و بەرنامە زانستییەکانیان لەوێوە دابمەزرێنن، بۆ ئەوەی بتوانن هەر سەرچاوەیەکی گشتی و بەشیی و هەر جۆرێك لە جۆرەکانی مەعریفە لەگەڵی بەراورد بکەن و بڕیار بدەن لەسەر تێڕوانینە قورئانییەکان و ڕەخنەیان لێ بگرن و

پاڵفتەیان بکەن پێی، هەروەها بۆ ئەوەی فەرمانبەرداربوونی قورئـان (حاکمیـة القـرأن) لـە دڵ و لۆژیکیاندا جێگیر ببێت.

هۆکاری ڕێگری لە نووسینەوەی بێجگە قورئان ئەوە نـەبووە کـە هەنـدێك باسـیان کـردووە و دەڵێن: (لە ترسی لێکچوون و تێکەڵبوونی قورئانی پیرۆز و فـەرموودە ڕیوایـەتکراوەکان بـووە)، ئەمـە شـتێکی زۆر دووره لـەو عەرەبانـەی خـاوەنی بەلاغـەت و بـەیانێکی وەهـا بـوون کـە جیاوازییەکی ئاشکرا و فراوانیان دەبینی لـەنێوان ئایەتـەکانی قورئـانی پـیرۆز و هـەر قسەیەکی دیکەدا، لەنێویشیدا فەرمایشتەکانی فەصیحترینی ئەو کەسەی کە وشەی (ضـاد)ی بـەکارهێناوە (دروودی خوا لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی بێت).

پێغەمبەری خواش (دروودی خوا لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی بێت) بەبێ هودە هـیچ قسەیەك ناکات، بۆیە مادام ڕێگری لە نووسینی هیچ شتێك بێجگە لـە قورئـان کـرد، ئـەوە مانـای ئەوەیـە حیکمـەتێکی زۆری تێدایـە کـە خـوای گـەورە فێـری کـردووەو سرووشـی بـۆ کـردووە، یـان ڕێگریکردنێکی ڕاستەوخۆیە لەلایەن خوای پـەروەردگارەوە، ئـەگینا عەرەبـەکان جیاوازییـان لـە نێوان وشەکانی قورئانی پـیرۆز و هـەر وشـەو ڕسـتەیەکی دیکـە دەکـرد، بـا لـە ئەوپـەڕی پلـەی ڕەوانبێژییشدا بوایە.

هـەروەها قورئـانی پـیرۆز بنـەماکای سـوونەت و فـەرموودەکانی پیغەمبـەر لـەخۆدەگریت و سووننەت و فەرموودەکانی پیغەمبەر لە ئایەتەکانی قورئان وەردەگیرێـن، نـەك بـە پێـچەوانەوە، کەواتە ناگونجێت تێکەڵاو ببن و لەبەر ئەوە ڕێگری کرابێت لەنووسینەوەی فەرموودە.

پێشەوا شافیعی لە کتێبی (الرسالة) لـە برگـەی: (٤٠، ٤١، ٤٢، ٤٣، ٤٤، ٤٥، ٤٦، ٤٨) دانـی بەم ڕاستیەدا ناوە و ڕوونیکردۆتەوە، دەفەرموێت: هەر کێـشە و ڕووداوێـك بەسـەر هەرکەسـێکی دینداردا بێت لە قورئانی پیرۆز دا بەڵگە هەیە بۆ ڕێگەی لێدەربازبوونی (مقدمة الرسالة ١٧ـ٢٠).

هەروەها زانایان لە دوای نەوەی سێهەمەوە، نەرمکێشییان لە ڕیوایەتکردنی فەرموودەکان بە مانا کردووە، بەتایبەتی (ئەو نەوەیەی ڕیوایەتی فەرموودەکانیان لەئەسـتۆ گـرت)، لەبەرئـەوەی قورئانی پیرۆز مانایەکانیان دووپاتیان دەکاتەوە، مەبەستەکانیان لەخۆدەگرێت، هـەروەك چـۆن کەلـەپووری گـشت پێغەمبـەرانی پـێش پێغەمبـەری خۆمانیـشی (دروودی خـوا لەسـەر خـۆی و هەموویان بێت) لەخۆگرتووە، بۆیـە ترسـێکی زۆر دروسـت نابێـت لـە هەڵـسوکەوتی هەنـدێك لـە

ڕاویــەکان لەگــەڵ وشــەکان و پــێش و پاشــکردنیان، بــەگویرەی تێگەیــشتنی خۆیــان، چــونکە لەدوایانەوە دوو پاڵاوگەی ورد هەیە، بۆ دروستی ئەم هەڵسوکەوتەیان:

یەکەمیان: پێویستە ئەو ڕیوایەتە لە قورئانی پیرۆز و زمانی عەرەبیدا بنەمایەکی هەبێت.

دووهەمیان: پێویستە قورئانی پیرۆز پەسەندی بکات و لەخۆی بگرێت

بەم شێوەیە دەتوانرێت هەڵەتێگەیشتنی ڕاوییەکان لــە فــەرموودەکان راســت بکرێتــەوە، جــا ئــەم هەڵەیــە بــەهۆی ئاســتی توانــای تێگەیــشتن و وەرگــرتنی ڕووی دابێــت، یــان بــەهۆکارێکی زمانەوانی، یــان بــەهۆی خوێندنــەوە بــۆ مانــای فەرموودەکــە و هۆکــاری وتنیــەوە، یــان بــە هــەر هۆکاریکی دیکە ڕوویدابیت.

گومانی تێدا نییە، نووسینەوە هۆکارێکی وردە بۆ پارێزگاریکردنی زانیارییەکان ـ بۆیــە هــیچ ڕەخنــە لــە عەرەبــەکان نــاگیرێ کــە پێیــانوابووە نووســراوەکان لــە خوێنراوەکــان باشــترن ـ نووسینەوە باشترە لە ئەزبەرکردن لە مێشکدا، ئەگەر هەڵەیەك دروست ببێــت لــە نووســینەوەدا، دەکرێت فریای بکەویت و چاکی بکەیتــەوە، بــەڵام هەڵــەکردن لــە مێــشکدا ئەگــەر جــێگیر بــوو و خەڵکی لەنێو یەکدی ئاڵوگۆڕیان کرد، ڕاستکردنەوەی زۆر ئەستەم دەبێت.

بەوەی کە وتمان، بۆمان ڕوون دەبێتــەوە کــە ڕێگرییکردنــی پێغەمــەر ـ دروودی خــوا لەســەر خۆی و بنەماڵەکەی بێت ـ لە نووسینەوەی فــەرموودە، لەبــەر ئــەوە نــەبووە کــە فــەرموودەکانی بەڵگە نین ـ وەکو ڕژهەڵاتناسەکان و ئەوانــەی ســوونن‌ەت ڕەتدەکەنــەوە و بــە بەڵگــەی دانــانێن ـ ڕایان وایە، لەنێو ئــەوان، ئەوانــەی نازناوێکیــان بــۆ خۆیــان دانــاوە کــە شایــستەی نــین، ناویــان لەخۆیان ناوە (قورئانی)، بەڕاستی ئــەوان قورئــانی نــین، ئەگــەر قورئــانی بوونایــە نەیانــدەتوانی (بەڵگایــەتی) فــەرموودە کــە بــە دەقــی ئاشــکرای قورئــانی پــیرۆز جــێگیرە، ڕەدبکەنــەوە و تێدەگەیشتن لەوەی ئەو کێشەیەی لە سەردەمی نەوەی گێڕانەوەی فــەرموودەدا ســەریهەڵداوە و توندتر بووە، لــە نــەوەی (الفقــە)دا کێــشە نــەبووە لــە خــودی (بەڵگایــەتی فــەرموودە)، چــونکە بەڵگایەتی فەرموودە، شتێکی ئەوەندە دیارە لــەنێو ئــایینی ئیــسلام کــە هــیچ بەڵگــەی ناوێــت، بــەڵکو ئــەم کێــشەیە لــە گێڕانــەوەی فــەرموودە دروســت بــووە کــە بریتیــە لــە (اســناد)ی ئــەو ڕیوایەتانەی کە گێڕدراونەتەوە، دەکرێت هەنــدێکیان خەســڵەتدار بکــرێن بــە دڵنیــایی (الــیقین) و هەندێکیشیان خەسڵەتدار بکرێن بە گومــان (الظــن)، بــەوەی بەڵگــەن، یــان نــا، ئــەو فەرموودانــە

بـــەگوێرەی بڕیـــاردان لەســـەری و ڕەخنـــەگرتن لـــە مـــەتنی فـــەرموودەکان، وەرگـــیراون، یـــان ڕەدکراونەتەوە، بەڵام ئەو فەرموودانەی کە بە جێگیری و دڵنیاییەوە لە پێغەمبـەر (دروودی خـوا لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی بێت) ڕیوایەتکراون، لەنێو ئیمانداراندا هیچ کێشەیەك لەبەڵگـەبوونیان نییە.

هەروەها ئەوەی باسمان کرد، لەو مەنهەجەی کە قورئـانی پـیرۆز پێـی هاتووەتـە خـوارەوە، وەرگیراوە، چونکە قورئانی پیرۆز ـ هەروەك دیارە ـ بە پارچە پارچەیی و لە ماوەی (٢٢) ساڵ و پێنج مانگ و (٢٢) ڕۆژ لە ژیـانی پێغەمبـەردا (دروودی خـوا لەسـەر خـۆی و بنەماڵەکـەی بێـت) هاتووەتە خوارەوە، خوای گەورەش لەو بارەیەوە دەفەرموێت: **{وقُرْآنًا فَرَقْنَـاهُ لِتَقْـرَأَهُ عَلَـى النَّاسِ عَلَى مُكْثٍ وَنَزَّلْنَاهُ تَنْزِيلًا}**. (الإسراء: ١٠٦)

مانای: ئێمە قورئانیشمان بەش بەش کردووە، تا بـە شـێنەیی و بـە ئـارامی بەسـەر خەڵکیـدا بیخوێنیتەوە، هەر ئێمەش بەو شێوەیە دامانبەزاندووە (کە تۆ ڕایدەگەیەنیت).

ئینجـا کاتێـك کافرەکـانی قـوڕەیش ڕەخنـەیان لـەم شـێوە دابەزینـە گـرت، قورئـانی پـیرۆز ڕەخنەکەیانی تۆمار کرد و گفتوگۆی لەگەڵ کردن لەم بارەیەوە و ئـەو حیکمەتـەی ڕوونکـردەوە کە بووەتە هۆی دابەزینی بەم شێوە، خوای گەورە فەرمووی: **{وقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ الْقُرْآنُ جُمْلَةً واحِدَةً كَذَلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِ فُؤَادَكَ ورَتَّلْنَاهُ تَرْتِيلًا} (الفرقان: ٣٢).**

مانای: کافرەکان وتیان: ئەوە بۆ قورئان بەیەك کەڕەت بۆی ڕەوانـە ناکرێـت، بێگومـان ئێمـە بەو شێوەیە ڕەوانەی دەکەین، تا دڵی تۆ زیاتر دڵنیا بکەین، بەردەوام بـە جـوانی دایدەڕێـژین و دەیگەیەنین.

هەر لەبەر هەمان حیکمەت ـ زیاتر دڵنیاکردنی دەروونـەکان بـە قورئـان ـ پێغەمبـەر (درووی خوا لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی بێت) ویستی کە هزر و دەروونی موسوڵمانان تـەنها بـە قورئـانی پیرۆزەوە خەریك ببێت ـ تا عەقڵ و دڵیان پێی جێگیر و دڵنیا ببێت و دەروونیان پێی ئارام ببێت و خۆشییەکانی تێکەڵ ببێت لەگەڵ دڵ و دەروونیان و ئایەتەکانی هـیچ فـشارێك دروسـت نەکـەن لەسەر هیچ لایەنێکی دیکەی ژیانیان، کاتێك پێیان کاریگەر دەبن.

بۆیە قورئانی پیرۆز بۆ نەوەی یەکەم بوو بەو عەقڵەی کە بیری پێدەکەنەوە و ئـەو دەروونـەی پێی دەژین و ئەو هەستیارییەی کە سۆز و هەستەکانیان پێکدەهێنێت و ئـەو چـاوانەی کـەدەورو

## کۆکردنەوەی هەردوو خوێندنەوەکە و دەروازەکانی

لێرەدا هەوڵ دەدەین ڕێگە خۆش بکەین لەبەردەم ڕوونکردنەوەی چۆنیەتی (کۆکردنەوە لە نێوان هەردوو خوێندنەوەکە)، بەوەی هەندێك لە ڕێڕەو و دەروازە گرنگەکان بۆ خوێندنەوەی هەریەك لە قورئان و گەردوون ڕوون بکەینەوە کە دەبنە یارمەتیدەرمان بۆ بەرنامەی مامەڵەکردن لەگەڵ کۆکردنەوەی هەردووکیان، با بە دەروازەکانی خوێندنەوەی قورئان دەستپێبکەین، کە ئەمانەن:

---

بەریانی پیدەبینن و، ئەو پرۆگرامەی کە هەموجوڵەو عەقڵ و دەروون و هەڵسوکەوتەکانیان ڕێکدەخات و لە هەڵەکردن دەیپارێزێت، هەرکاتێکیش شەیتان هەڵەیەکی پێکردن لەم بوارانەدا، بیر دەکەنەوە و چاویان هەڵدەهێنن بۆ ڕاستی و دۆزینەوەی ڕێگەی ڕاست هەر بە قورئانی پیرۆز.

تێڕوانینی ئەشعەرییەکان بۆ ئەو فەرمایشت و ئەسەرانەی کە هەن لەبارەی ڕێگرییکردنی پێغەمبەر (دروودی خوا لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی بێت) لە کتێبی مامۆستامان عەبدولغەنی عەبدولخالق (حجية السنة) لە لاپەڕەی (٣٩٠ بەولاوە) دەستتدەکەوێت، هەروەها لە کتێبی د. محمد عجاج الخطیب (السنة قبل التدوين) لە بەشی چوارەمیدا (متى دون الحديث؟) لاپەڕە (٢٩٣-٣٨١) دەستتدەکەوێت، کە بەڕاستی، دانەرەکەی - خوا پادشتی بداتەوە - هەموو ئەو بابەتانەی کۆکردووەتەوە کە پەیوەندییان بە کۆکردنەوە و نووسینەوەی فەرموودەوە هەیە، هەموو ئەو ڕا و بۆچوونانەی گفتوگۆ کردووە کە لەم بارەیەوە وتراون. ئێمە لەگەڵ دانەرەکەی لە زوربەی ئەو شتانەی باسی کردوون هاوڕاین، جیاوازیشین لەگەڵی لەبارەی هەندێك لە دەرئەنجامەکانی، بەڵام پێویستە ئەوە بڵێین کە ئەوەی ئەو باسی کردووە هیچ توێژەرێکی ئەم بوارە لێی بێ نیاز نابێت.

### ١. دابەزاندنی قورئان بۆ سەر دڵ و دەروون لەلایەن خوێنەرەوە

بەڕاسـتی دابەزانـدنی قورئـان بـۆ سـەر دڵ و دەروون لەلایـەن خوێنەریـەوە - بـەو شـێوەیەی کـە ڕوونمـانکردەوە - دەروازەیـەکی سـەرەکییە لـە دەروازەکـانی لێتێگەیـشتنی، ڕەنگـە بڵـێین گـرنگترین دەروازەکانی (کۆکردنەوە لە نێوان هەردوو خوێندنەوەکە)ـیە، چونکە خوای گەورە دەفەرموویێت: {قُلْ مَنْ كَانَ عَدُوًّا لِجِبْرِيلَ فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَى قَلْبِكَ بِإِذْنِ اللَّهِ مُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَى لِلْمُؤْمِنِينَ}. (البقرة: ٩٧)

مانای: ئەی محەممەد (دروودی خوای لەسەر بێت) پێیان بڵێ: هـەر کەسێك دوژمنی جوبرەئیلە، - با بزانێت - کە ئەو جوبرەئیلە بە فەرمانی خوا ئەو قورئانـەی دابەزاندووەتـە سـەر دڵـت، کـە کتێبـە پێـشووەکان بەڕاست دادەنێت و ڕێنموونیی (بۆ چاکە) دەکات و مژدەبەخشیـشە بـە ئیمانداران). هەروەها دەفـەرموویێت: {وإِنَّـهُ لَتَنْزِيـلُ رَبِّ الْعَـالَمِينَ (١٩٢) نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الآمِينُ (١٩٣)عَلَى قَلْبِـكَ لِتَكُـونَ مِـنَ الْمُنْـذِرِينَ}. (الـشعراء: ١٩٢ــ١٩٤). مانـای: بەڕاسـتی ئـەم قورئانـە لەلایـەن پـەروەردگاری جیهانەکانەوە ڕەوانە کراوە، جوبرەئیلی ئەمین (فریـشتەی وەحـی) بـۆ سەر دڵی تۆ ئەی محەممـەد ( درودی خـوای لەسـەر) دایبەزانـدووە، تـا بـچیتە ڕیـزی ئـەو کەسـانەوە کـە خـەڵکی بێـدار دەکەنـەوە. هەنـدێك دەروازەی دیکەش بۆ چوونە نێو جیهانی قورئانی پیرۆز هەن، لەوانە:

### ٢. دەروازەی باوەڕبوون بە ( یەکێتی بینای قورئانی پیرۆز ):

چوونە ژوورەوە لەم دەروازەیەوە بۆ خوێندنەوەی قورئـانی پـیرۆز و تێگەیـشتن لـە یـەکێتی بینایەکـەی وا لەخوێنـەر دەکـات لـە مەیـدانی قورئانی پیرۆزدا بسووڕێتەوە و بڕوانێتـە هـەموو ئایەتـەکانی و بگـەڕێت بەدوای هەموو تۆڕە پەیوەندیدارەکان لەناویاندا، بۆ ئەوەی بزانێت چـی دەخوێنێتەوەو جوان تێبگات لەوەی دەیخوێنێتەوە.[1]

### ٣. دەروازەی دەرچوون لە باوەڕبوون بە ( یەکێتی سوورەت )ـەوە:

ئەمـەیان دەروازەیەکـە کـە زۆر جیـاواز نییـە لـە دەروازەی (یـەکێتی بینایەکەی)، بەڵام لەم دەروازەیاندا خوێنەری ڕاهاتوو ڕادەوەستێت لەسەر یـەك سـوورەت و بەتایبـەت جـودای دەکاتـەوە. لـەوێوە بەلێوردبوونـەوە بەرەو گەڕان لە کۆڵەکەکەی دەڕوات، ئەو کۆڵەکە و ڕاگرانـەی سـوورەتەکە پـشتی پێبەسـتوون. مەبەسـتمان بـەو کۆڵەکانـە ئەوەیـە کـە: هـەموو سـوورەتێك بابـەتێکی سـەرەکی هەیـە، ئایەتـەکانی هـەمووی هـاتوون بـۆ ڕوونکردنەوەی ئەو بابەتە سەرەکییە و لابردنی پەردە لەسەر ئەو شتانەی پەیوەنـدییان پێوەیـەتی، هـەموو بابەتـەکانی دیکـە لـە چـواردەوری ئـەو

---

[1] بـۆ زانـینی مەبەسـت لـە(یـەکێتی بینایەکـەی) بـە درێـژی و چـۆنیەتی بـەکارهێنانی بـــەگوێرەی ئـــەوەی دیارییکـــەری بەرنامەکانـــە و بـــە گـــوێرەی چـــۆنیەتی ڕیکخـــستن و دروستبوونی، بە تەنیا لـە باسـێکی سـەربەخۆدا باسمـان کـردووە، وا باشـە بـۆ تێگەیـشتن لـەم دەروازە بەشـێوەیەکی گونجـاو بگەڕێیتـەوە سـەری. لـە گۆڤـاری (الکلمـة) لـە ژمـارە (٤٣) بەهاری (٢٠٠٤م) بڵاوکراوەتەوە. (دانەر)

بابەتــە ســەرەكییە دەســوڕێنەوەو پاڵپــشتی لێدەكــەن و زیــاتر ڕوونــی دەكەنەوە، كەواتە وەك ئەو مێخانە وان كە پاڵپشتی لە عەمودی ســەرەكی خێوەت، یان ماڵ دەكەن. مامۆستا (الإصلاحي)[1] لەم بارەیەوە بابەتێكی باشــی نووســیووە، پێویــستی بەكەســێك هەیــە لەســەری زیــاد بكــات و فراوانتری بكات، وەك مامۆستا (أمين الخولي)[2] ئاماژەی پێكردووە.

---

([1]) بگەڕێرەوە بۆ كتێبی مامۆستا عبدالحمید الفراهي الإصـلاحي (خـوا ڕەحمـی پـێ بكـات) (سلـسلة دراسـات في التأويـل و علـوم القران)، لـەوێ بابـەتێكی تایبـەت كـردووە بـۆ قـسەكردن دەربارەی (عمود السورة) مانـای: كۆڵەكـەی سـورەت، لـەوێ ئـەوەی دووپـات كردووەتـەوە كـە هــەموو ســورەتیك كۆڵەكەیــەكی هەیــە، پێویــستە خوێنــەری لێــی وردبێتــەوە و بیدۆزێتــەوە، بۆئــەوەی مانایەكــەیو ئــەو بابەتانــەی كــە لــەخۆی گرتــووە تێیبگــات. ئــەم لێكۆڵینــەوەش (المكتبة الإصلاحية) لـە علیكـر لـە هیندسـتان بـڵاوی كردووەتـەوە. دووبـارە هەنـدێكی لەلایـەن (دارالغرب الإسلامي) لیَ بڵاوكراوەتەوە.

(٢) بەوشێوەیەی كە لە كتـێبی (مـسؤلية التأويـل) ص١٣٩ بـەولاوە، دكتـۆر مـستەفا ناسـف هاتووە.

### ٤. دەروازەی بەها بەرزەکان، کە بریتیە لە:
### (یەکتا پەرستی، خۆپاککردنەوە، ئاوەدانکردنەوە)[(١)]:

ئەم سێ بەهایە لە گرنگیاندا گەیشتوونەتە ئاستێك دەتوانین بڵێین ئەو تەوەرە سەرەکییەکانەی قورئانی پیرۆز پێکدەهێنن کە هەموو سوورەتەکانی و ئایەتەکانی و وشەکانی بەچواردەوریدا دەسوڕێنەوە و هاوبەشی دەکەن لە کارکردن بۆ پتەوکردن و جێگیرکردنیان.

* (یەکتاپەرستی): مافی خوای گەورەیە لەسەر بەندەکانی کە باوەڕ بە یەکێتی و یەکتاپەرستی بهێنن و باوەڕ بە تاك و تەنیایی ئەو لە خودی خۆیداو لە سیفەتەکانیدا و لە کردەوەکانیدا بهێنن. لەبەر گرنگی زۆری یەکتاپەرستی، زۆربەی سوورەت و ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بەچواردەوریدا دەسوڕێنەوە، چونکە هەموو شتەکانی دیکە لەسەر ئەو رادەوەستن، چونکە ئەو کرۆکی عەقیدە و پایە و کۆڵەکەکانی باوەڕە.

* (خۆپاککردنەوە): ئەمیشیان ئەو ئامادەکارە بنەڕەتی و گشتگیرەیە کە مرۆڤ وا لێدەکات ئامادەبێت و توانای هەبێت لەسەر هەستان بە ئەرکی جێنشینی و گەیاندنی ئەمانەت و بەجێگەیاندنی بەو پەیمانەی کە داویەتی بە خوای گەورەو ئاوەدانکردنەوەی زەوی و

---

(١) بڕوانە کتێبی (التوحيد التزكية العمران) دکتور طه جابر العلواني، (التوحيد) لەنێو کتێبی (المنهجية الإسلامية) (القاهرة: دار السلام، ٢٠١٢م) والتصوف والسلام، لە ژێر چاپکردندایە.

میراتگری له دنیا، خوای گەورە دەفەرموویت: {وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِنْ بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ} . (الأنبياء: ١٠٥)

مانای: سوێند بەخوا، بەڕاستی ئێمە لە کتێبی زەبوردا دوای تەورات، بڕیارمان داوە کە بێگومان بەندە شیاو و چاکەکانمان دەبنە میراتگر و خاوەنی زەوی. هەروەها خۆپاککردنەوە وا لە مرۆڤ دەکات کە ئامادەبێت بۆ میراتگرتنی فیردەوسیش لە دواڕۆژدا، خوای گەورە دەفەرموویت: {الَّذِينَ يَرِثُونَ الْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ} . (المؤمنون:١١).

مانای: ئەوانە دەبنە خاوەنی بەهەشتی فیردەوس (کە بەرزترین و بە نرخترین بەهەشتە) و بۆ هەمیشە ژیانی نەبڕاوەی تیادا دەبەنەسەر (لەوپەڕی لاویەتی و تەندروستی و ئاسوودەییدا).

* (ئاوەدانکردنەوە): ئەمیش ئەو کارەیە کە بە مرۆڤ سپێردراوە بە پەیمانی جێنشینکردن، ئەو مەبەستەیە کە خوای پەروەردگار لەبەر خاتری بەدیهێنانی، هەموو سرووشتی بۆ مرۆڤ دروستکردووە و خستویەتە بەردەستی.

ئێمە لە یاسا و ڕێسا گەردوونیەکان - لەناویشیان ڕامکردن و ئاوەدانکردنەوە - زۆرێك لە بەڵگەکانی بوون و تاك و تەنیایی خوای گەورە لە خودی خۆیدا و لە سیفەت و کردارەکانیدا هەڵدەهێنجین. بە وردبوونەوەش لەو یاسا و ڕێسایانە دەتوانین ئەو شتانە هەڵبهێنجین کە گونجاوە لەگەڵ ئەو فیترەتەی خوای پەروەردگار لەسەری دروستی

کردووین، لەسەر بەڵگەکانی (دروستکردن و بەدیهێنان و چاودێری و بەڕێوەبردن و ڕێگرییکردن (تمانع).. هتد) شتێکی وا بینا بکەین وامان لێبکات توانامان هەبێت لەسەر ڕۆیشتن بەرەو پیری بانگەوازی ئەو فیترەتەی کە لەسەری دروستکراوین و وەڵامدانەوەی و گوێبگرین و وەڵامی بانگەشە و بانگەوازی پێغەمبەران (دروودی خوایان لەسەر بێت) بدەینەوە، ئەوکاتە قورئانی پیرۆز و پێغەمبەر (دروودی خوا لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی بێت)، لەگەڵیشی هەموو پێغەمبەران لە ڕووی دەرەکی، فیترەتی مرۆڤایەتیش لە ڕووی ناوەوە یەکانگیر دەبن بۆ بەدیهێنانی ڕێنمایی و خۆپاککردنەوە و دروستکردنی ئاوەدانی، کە بریتیە لە ڕەنگدانەوەی ڕوحی بەندایەتی و ڕێنمایی و خۆ پاککردنەوە لەسەر گەردوون و سرووشتی ڕامکراو.

مرۆڤ دەگۆڕێت بۆ سەرکردایەتیکردنی کاروانی ئەو تەسبیحاتەی هەموو شتێك لە گەردووندا بە ئاراستەکردنی خودی و خۆڕسکی ئەنجامی دەدات، بێجگە لە مرۆڤ، کە ئەم کارە بە ئازادی و هەڵبژاردنی خۆی دەکات، خوای گەورە دەفەرمووێت: {تُسَبِّحُ لَهُ السَّمَاوَاتُ السَّبْعُ والأَرْضُ ومَنْ فِيهِنَّ وإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ ولَكِنْ لاَ تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ إِنَّهُ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا}. (الإسراء: ٤٤)

مانای: هەر هەموو ئاسمان و زەوی و هەموو ئەوانەی تیایاندا هەن، تەسبیحات و ستایشی ئەو زاتە دەکەن، هیچ شتێك نییە لەم بوونەوەرەدا تەسبیحات و ستایش و سوپاسی ئەو زاتە نەکات، بەڵام

ئێوە لە تەسبیحات و ستایشی ئەو شتانە تێناگەن، بەڕاستی ئەو زاتە هەمیشە و بەردەوام خۆگر و بە حەوسەڵەیە (لە بەرانبەر لادانی خەڵکیەوە) لێخۆشبووە و چاوپۆشی دەکات ( ئەگەر ڕووی تێبکەن و باوەڕی پێبهێنن). جا چۆن ئێمە لەم تەسبیحاتە تێبگەین؟

بە وردبوونەوە و بیرلێکردنەوەو ژیری، بە ڕامان لە دروستکردنی زەوی و ئاسمانەکان، خوای گەورە دەفەرمووی: {وَمَا مِنْ دَابَّةٍ فِي الأَرْضِ ولاَ طَائِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلاّ أُمَمٌ أَمْثَالُكُمْ مَا فَرَّطْنَا فِي الْكِتَابِ مِنْ شَيْءٍ ثُمَّ إِلَى رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ}. (الانعام: ٣٨)

ماناى: هیچ زیندەوەر و گیانلەبەرێك نییە بەسەر زەویدا بڕوات و هیچ باڵندەیەك بە باڵەکانی بفڕێت کە ئوممەت و گەلێك نەبن وەك ئێوە، (دڵنیابن) هیچ شتێك نییە پشتگوێمان خستبێت لە کتێبە (تایبەتیەکەی لە لوح المحفوظ)تەوە، دوایی هەر هەموو ئەوانە کۆدەکرێنەوە بۆ لای پەروەردگاریان، (بۆ ئەوەی دادگایی بکرێن و هەموو کەس مافی خۆی وەربگرێت، یان تۆڵەی ڕەوای لێبسەنرێت). جا هەر کاتێك لەم دەروازانەوە دەست بە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز دەکەین، ئەوا بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ ئەو دەروازانەوە پەلکێشمان دەکەن بۆ تێڕوانین بۆ دوای خۆیان و ئەوەی پەیوەندیدارە پێوەیان، بۆ ئەوەی دەروازەی پێنجەممان بۆ دەربکەوێت لە دەروازەکانی خوێندنەوەکە بریتییە:

## ٥. دەروازە چوونە نێو مەیدانی قورئانی پیرۆز لە ڕێگەی پەیوەندییەکان لە نێوان خوای پەروەدگار و مرۆڤ و گەردوونی ڕامکراو:

چونکە کاتێك دەڵێین: (الله) هەموو زانستەکانی پەنهانی (الغیب) بەم وشەیە لە زیهنماندا ئامادە دەکەین، کاتێکیش دەڵێین: (مرۆڤ) ئاماژە دەکەین بۆ هەموو ئەو شتانەی پەیوەندییان بە مرۆڤەوە هەیە، هەر لە (جیهانی پەیمانی یەکەمەوە)[1] یان (جیهانی زەڕڕە)، لەوێوە بەرەو جیهانی دروستکردن و دەرکەوتن لە بوونەوەردا و فەرمان بە ئامادەبوون بۆ بەدیهێنانی مەبەستە گرنگەکان، تا کۆتایی جیهان و گەڕانەوە بۆ بەهەشت، یان دۆزەخ.

---

(١) ناوی (جیهانی پەیمانی یەکەم) بەو ساتەوەختە دەگوترێت کە خوای پەروەردگار قسەی لەگەڵ روحی وەچەکانی ئادەم کردووە، (ڕۆژی قالوا بلی) کە خوای پەروەردگار بەم ئایەتانە ئاماژەی پێدەکات: {وإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنْ بَنِي آدَمَ مِنْ ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وأَشْهَدَهُمْ عَلَى أَنْفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا بَلَى شَهِدْنَا أَنْ تَقُولُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَذَا غَافِلِينَ (١٧٢) أَوْ تَقُولُوا إِنَّمَا أَشْرَكَ آبَاؤُنَا مِنْ قَبْلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةً مِنْ بَعْدِهِمْ أَفَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ الْمُبْطِلُونَ} (الاعراف: ١٧٢، ١٧٣)

مانای: یادی ئەو کاتە بکەرەوە کە پەروەردگارت ئەڕواحی پشتاوپشتی نەوەکانی ئادەمی کۆکردەوە و پەیمانی لێوەرگرتن و کردنی بە شاهێد بەسەر خۆیانەوە و پێی فەرموون: ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم؟! هەموو وتیان: نابێ تۆ خوای ئێمە نەبیت، بەڵێ، شاهێدیماندا کە تۆ پەروەدگارمانیت، ئەمەش بۆ ئەوەی نەوەکو لە ڕۆژی قیامەتدا بڵێن: بەڕاستی ئێمە لەمە بێئاگا بووین!!، یاخود نەوەك بڵێن: جا ئێمە چی بکەین، بەڕاستی باو و باپیرانمان لە پێشدا هاوەڵیان بۆ خودا داناوە، ئێمەش نەوەیەك بووین دوای ئەوان هاتین و شوێنیان کەوتین، جا ئایا تۆ بەتەمایت بەهۆی ئەوەی پێشێلکەرانی حەق کردوویانە، لەناومان ببەیت؟

کـاتێکیش کـە دەڵـێین: (گـەردوون) مەبەسـتمان پێـی جیهـانی دروستکراوەکان و ئەو یاسا و ڕێسایانەیە کە ڕوویان تێدەکـەن و بۆیـان ئامـادەکراون، ئـەو دروسـتکراوانەش تیایـدا جۆراوجـۆرن، وەك: زینـدەوەران و دەریـا و زەریاکـان و ڕۆژ و مـانگ و بوونـەوەران، لەنێویشیاندا خودی مرۆڤ.

ئەمەش مانای ئەوەیە، ئێمە لە پەیوەندی نێوان خوای گەورە و مرۆڤ و گـەردوون دەکۆڵینـەوە، لـە چـۆنیەتی دروسـتبوونی کـردار و بەرچەکردارەکان و ئەوەی پێی دەگوترێت (کاریگەربوون) بە هەموو ئەو شتانەی کە خوای پەروەردگار لە قورئـانی پـیرۆزدا بـۆی باسـکردووین، بەمەش هۆشیارییەکی وا بەدەستدەهێنین کە بـە هۆیـەوە دەتـوانین لـە قورئانی پیرۆز وردببینـەوە و بـە ڕێکـوپێکی بیخوێنینـەوە، بۆ ئـەوەی جـوان تێیبگـەین لـە ژیـان و ئـەو ژینگەیـەی کـە لـەم قۆناغەمانـدا دەیگوزەرێنین کە لە بوونی بە بازنەیەك لە بازنـەکانی مێـژووی خێزانـی مرۆڤایەتی دووردرێژمان دەرناچێت. دەروازەی بەها بەرزەکان لە نێوان دروستکەر و دروستکراوەکان دەبنە باشترین هاوڕێ بۆمان، کاتێك لەنێو ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدا، دەخولێینەوە.. خواش زاناترینە.

### ٦. دەروازەی ( ڕێکخستنی بابەتیانە ):

ئـــەوەش لـــە دوای ئـــەوە دەبێـــت کـــە بـــەردەوام دەبـــین لەســـەر خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز و ورد دەبینەوە لە گرنگترینی ئـەو بابەتـە فراوانانـەی کـە لەناویـدا دەدرەشـێنەوە و خۆمـان ڕادەهێـنین لەسـەر بابەتەکانی وەك: باوەڕ، بێباوەڕی، هاوەڵدانان بۆ خوا، دووڕوویی، حەق و ناحەق، نوێژ، زانـست، چاکسازی و تێکـدانو..هتـد، پاشـان دەسـت دەکـەین بـە کۆکردنـەوەی ئـەو ئایەتانـەی پەیوەنـدییان هەیـە بـەو بابەتانەوە ـ بە تێڕوانینی خۆمـان ـ ئـەوەش بـە گـەڕان و بەدواداچـوون لەنێو گشت ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بەبێئاگابوون لە (یـەکێتی بینـای قورئان) کە دەخوازێت هەموو قورئانی پیرۆز بخەینە پێش چاوی خۆمان کاتێك کە لێکۆڵینەوە دەکەین بۆ هـەر بابـەتێك لـە بابەتـەکانی، پاشـان دەست دەکەین بە کاری بیرکردنەوە و وردبوونەوە، هەندێکی لادەبـەین و هەندێکی زیاد دەکەین، تـا ئـەو کاتـەی دڵنیـا دەبـین لـەوەی ئـەوەی کۆمانکردووەتەوە لە ئایەتەکان، هەموو ئەو شتانەن کە پەیوەندییان بە بابەتەکەمانەوە هەیە. بە مـەرجێك هـەر ڕانەوەسـتین لـە بیرکردنـەوە و لێوردبوونەوە و زیاد و کەمکردن، پاش ماوەیەك خۆمان دەبینینەوە کە وابەستە بووین لەگەڵ هەموو قورئـانی پـیرۆز و یـەکێتی بینایەکەیـەوە، ئەو کات تێگەیشتن و هۆشیارییمان بە شێوەیەکی گـشتی لـە بارەیـەوە زیاتر دەبێت.

**لێرە دەکرێت بەڵگە بهێنینەوە بەو فەرمایشتەی کە لە ئیمامی شافیعیەوە ـ ڕەحمەتی خوای لێبێت ـ نەقڵ کردووە، ئیمامی شافیعی کاری زۆری لەسەر کۆکردنەوەی ئایەتەکانی ئەحکام لە قورئانی پیرۆز کرد و کتێبێکیشی لەوبارەیەوە بەناوی (أحكام القرأن) هەیە کە ئیمامی بەیهەقی کۆی کردووەتەوە، ئایەتەکانی ئەحکام لەلای فەقیهەکان ژمێردراوە، کە بەلای زۆربەیانەوە لە ٥٠٠ ئایەت تێپەڕ نابێت، هەندێکیشیان پێیانوایە لە (٢٤٠) ئایەت تێپەڕ نابێت، بەڵام ئیمامی شافیعی دوای ئەوەی کە ورد بووەوە لەم جۆرە لە ئایەتەکان، بۆی دەرکەوت کە ناکرێت ئەحکامەکان تیایاندا بژمێردرێن، بۆیە ئاماژەی بەوە کرد کە لەنێو نموونەکانی قورئانی پیرۆزیشدا نموونەی زۆر هەیە[1]، بەڵکو دەکرێت بڵێین لەنێو چیرۆکە قورئانییەکانیشدا ئەحکامی**

---

(1) پەندە قورئانییەکان بڕیاڕ و تەشریعاتەکان لەخۆیان دەگرن، هەروەك چۆن پوختەی ئەزموون و تاقیکردنەوەکان دەگرنەوە، ئەگەرچی لەسەر شێوەی ناسراوی ئایەتەکانی ئەحکام و تەشریعاتەکان نەشهاتوون، بۆیە پێشەوا شافیعی (ڕەحمەتی خوای لێبێت) بەپێویستی زانیوە بۆ موجتەهید کە زانیاری تەواوی لەسەر ئەو پەندە قورئانیانە هەبێت، بۆیە کاتێك باسی مەرجە زانستییەکانی موجتەهید دەکات، دەفەرمووێت: ".. پاشان پێویستە موجتەهید زانیاری هەبێت بەو پەندە قورئانییانەی کە بەڵگەن لەسەر پێویستی گوێڕایەڵی خوای گەورە و دوورکەوتنەوە لە بێ فەرمانیەکانی..."، کردووشیەتی بە بەشێك لەوەی پێویستە لەسەر موجتەهید بیزانێت وەك بەشێك لە زانستە قورئانییەکان (علوم القرآن) وەك لە کتێبی (الاتقان) (٢/١٣١) باس کراوە.

زۆر هەیــە، چــونکە ناکرێــت حوکمــەکان دەربهێنــرێن و لــە هــەموو لایەنــەکانیان تێبگــەین، بــەبێ زانــینی ســیاق و هــەموو لایەنــە پەیوەندیدارەکانی. شتی بەسودمان (إن شاءالله) بە درێژی لەسەر ئـەم بابەتە باسکردووە، لە کاتی باسکردنی (الوحدة البنائیة للقـرأن المجیـد) بگەڕێرەوە بۆ ئەوێ و لەگەڵ ئەم دەروازەیە گرێی بدە.

---

پێـشەوا مـاوەردی دەفـەرمووێت: "... زانـستی پەنـدەکانی قورئـان لـە گـەورەترین زانستەکانی قورئانـە، بـەڵام خـەڵك لێـی بێئاگـان..."، وەك لـە کتـێبی (برهـان)ـی زەرکەشـی (٤٨٦/١)، کتێبی (الاتقان) (١٣١/٢) هاتووە.

ئیمامی سیوتی لە شێخ عیزەددین دەگوازێتـەوە کـە فەرموویـەتی: "خـوای پـەروەردگار بـۆ پەند و ئامۆزگاری و بە بیرهێنانەوە پەندەکانی لـە قورئـانی پـیرۆزدا بـاس کـردووە، جـا ئـەوەی باسی جیاوازی پاداشت، یان بەتاڵبوونەوەی کردەوەکـان، یـان سـتایش، یـان سەرزەنـشتکردنی تێدا بێت، ئەوە دەبێتە بەڵگە لە سەر حوکمە شەرعییەکان". الإتقان (١٣١/٢).

ئیبن خەلاد رامهرمـزی دەفـەرمووێت: "... پەنـدەکانی قورئـانی پـیرۆز بـریتین لـەو شـتانەی خوای پەروەردگار لە قورئاندا بەڵێنی تێدا هێناون، یان هەڕەشـەی تێـدا کـردوون، یـان حـەلاڵ و حـەرام، یـان ئومێـد، یـان ترسـی تێـدا بـاس کـردوون، یـان هاوبەشـدانەرەکانی پـێ ئاگـادار کردوونەتـەوە و کردوونـی بـە پەنـد و ئامۆژگـاری و بەبیرهێنانـەوە، کردوونـی بـە بەڵگـە لەسـەر دەسەڵاتی ڕوون و ئاشکرا و بێ کۆتایی خۆی لە دنیا و دوارۆژدا، پەند و ئامۆژگاری هەرە بەرز و بڵند لە زەوی و ئاسمانەکاندا هەر هی خوادی گەورەیـە و ئـەو خـاوەنی دەسـەلات و گـەورەیی و دانایی بێ وێنەیە..". وەك لە پێشەکی کتیبی (أمثال الحدیث)ی (رامهرمزی)دا هـاتووە. بـۆ ئـەم بابەتە بۆ کتێبی (الأمثال في القرآن الکریم) د. محمد جابر الفیاض (لا: ٢٦٦) بگەڕێرەوە.

## ٧. دەروازی لێکۆڵینەوە لە گونجاندنەکان:

گونجاندنەکان، یان گونجاوی نێوان ئایەت و سوورەتەکان زانستێکی ورد و گرنگــە، زۆرێــك لــە زانایــانی پێــشین هــەوڵیان بــۆ لــە یەکـدی نزیککردنەوەی ئایەتەکان و سوورەتەکان داوە، هەندێکیشیان بێتوانایی خۆیان لەبەردەم ئەم بابەتەدا ڕاگەیاندووە، هەندێکیان بازیان بەسەریدا داوەو بەرەو دەروازە ئاسانەکانی دیکە، ڕۆیشتوون.

پێشەوا ڕازی (ك: ٦٠٦ك) دەفەرمووێت: (... هەرکەسێك بـیر لـە وردی ڕیزبەندی سوورەتەکان و جوانی ڕێکخستنیان بکاتەوە، دەزانێـت قورئـانی پیرۆز هەروەك چۆن بەهۆی بە ڕەوانبێژی وشـەکانی و گـەورەیی ماناکـانی دەستەوەسـتانکەرە (معجـز)ــە، هـەروەها بـەهۆی ڕێکخـستن و ڕیزبەنـدی ئایەتەکانیــشیەوە، دەستەوەســتانکەرە (معجــز)ـــە...). هـــەروەها دەفەرمووێت: (زۆربـەی بابەتـە ورد و جوانـەکانی قورئـانی پـیرۆز لـە نێـو ڕێکخستن و پەیوەندی نێوان ئایەت و سـوورەتەکان دانـراوە...)[1]. قـازی ئەبوبەکر ئیبنولعەرەبی کە یەکێکە لە زانایانی سەدەی شەشـەمی کۆچـیی (٥٤٣ك) دەفەرمووێت: (... وابەستەبوونی ئایەتەکانی قورئـانی پـیرۆز بـە یەکدیـەوە بەشـێوەیەکی وا کـە وەك یـەك وشـە و مانایـەکانیان گونجـاو و ڕێکوپێك لەگەڵ یەکدی زانستێکی گەورەیە...)[2].

---

(١) بگەڕێوە بۆ سەرچاوەی پێشوو (الوحدة البنائية).

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(بورهانەدین بیقاعی) کە خاوەنی کتێبی (نظم الدرر في تناسب الآيات و السور)ـە کە دیارترینی ئەو کتێبانەیە لەم بابەتەدا نووسراون، دەفەرموویێت: هەر سوورەتێکی قورئانی پیرۆز تەماشا بکەی با بابەتەکانی ناویشی جیاواز بن، سەرەتایەکەی پەیوەندی بە کۆتاییەکەیەوە هەیە و بە پێچەوانەشەوە، بە هەموویەوە بۆ یەك مەبەست ئاماژە دەکات، هەروەها ڕستەی هەریەکێك لە بابەتەکانی پەیوەندییان بە یەکدیەوە هەیە. بۆیە ئەو کەسەی تەماشای ڕیزبەندیی سوورەتەکە دەکات، بێنیاز نابێت لەوەی کە بە تەواوی تەماشای هەمووی بکات، هەروەك چۆن بێنیاز نابێت لە تەماشاکردنی بەشەکانی یەك ڕستە لە ڕستەکانی...).

مەبەست پێی ڕستەی مەنتیقیە کە بریتییە لە یەك ڕستە ٤٥ جا، کاتێك لەم دەروازەیەوە دەست بە خوێندنەوەی وردی قورئانی پیرۆز دەکەین، دەکرێت ڕاهێنان بکەین بەوەی کە سوورەتێك لە سوورەتەکان بگرین - سوورەتێك کە ئەستێرەکانی زۆربن و بابەتەکانی جۆراو جۆربن و ماناکانی فراوان بن - پاشان ئایەت لەدوای ئایەت، کۆمەڵ لە دوای کۆمەڵ بەدواداچوونی بۆ بکەین، پاشان بە وردی بیر لە سەرەتای سوورەتەکە و ڕێڕەوی سیاقەکەی، هەتا دەگاتە کۆتایی، بکەینەوە و بڕوانینە ئەو پەیوەندییەی لە نیوان ناو و ناوەڕۆکەکەی هەیە، بۆ ئەوەی ببێتە سوورەتێکی سەربەخۆ، پاشان بڕوانیە سوورەتەکەی پێشی و سوورەتەکەی پاشی، ئەوکاتە تۆڕێکی فراوانی پەیوەندییمان بۆ

دەردەکـــەوێت لەناویـــدا کـــە وای لێـــدەکات وا هەســـت بکـــەین لـــەو سەردەمەداین کە تیایدا هاتووەتە خـوارەوە، وەك ئـەوەی یـەك پارچـە بێت، یان کە بە یەك پارچە هاتبێتـە خـوارەوە. ئـەم دەروازانـە چـەند دەروازەیەکی پێشنیازکراو بوون، بریتی بوون لە بەرهەمی ژیـان لەگـەڵ قورئانی پیرۆز و هەوڵێکن بۆ نزیکبوونەوە لێی، بەهیچ شێوەیەك بـریتی نیین لـە کۆتـایی ئـەو دەروازانـەی بـۆ نزیکبوونـەوە لـە قورئـانی پـیرۆز پێویستن، چونکە قورئانی پـیرۆز هـەرگیز سـوڕهێنییەکانی بـەهۆی زۆر خوێندنەوەو دووبارەکردنەوەی تەواو نابن و کۆن نابن.

## دەروازەکانی خوێندنەوەی گەردوون:

گەردوونیش چەندین دەروازەی بۆ خوێندنەوە تێدایە، هەروەك چۆن سرووش (وحی) چەندین دەروازەی هەبوو، لەوانە:

### ١. دەروازەی دروستبوون:

ئەم دەروازەیە ئەوە دەخوازێت بـاوەڕی تـەواومان هـەبێت و بەتـەواوی دڵنیابین لەوەی کە گەردوون ـ هەمووی ـ دروستکراوی خوای گەورەیە و بە ویستی خۆی دروسـتی کـردووە و بـە فەرمانـەکانی ئـەو پێکهـاتووەو هاتووەتەدی و بە بڕیاری ئەو بووە بە شتێك کە باسی لێبکرێت، خودای بێگەرد دروستی کردووە، هەموو شتێك لـەلای ئـەو ئەنـدازە و سـنووری دیارییکراوی هەیە و بۆ مەبەستێکی دیارییکراو دروستکراوە، بۆیـە هـیچ

ڕێگەیەك نییە بۆ ئەوەی بووترێت بە ڕێکەوت، یان بەبێ هودە، یان بەبێ مەبەست ئەم گەردوونە دروستبووە، بەڵکو هەموو شتەکانی نێو گەردوون هۆکاریان هەیە و بە مەبەست هاتوونەدی.

هەستان بە کاری جێنشینی و بەجێگەیاندنی ئەو پەیمانەی کە مرۆڤ بەڕاستی بە پەروەردگاری داوە و هەستان بە داخوازییەکانی ئەو پەیمان و ئەمانەتە و سەرکەوتن لەو تاقیکردنەوەیە و دەرچوون لە بەرپرسیارەتی تەکلیف، هەموو ئەمانە شتانێکن کە هەستان پێیان لەسەر جوان تێگەیشتن لێیان دەوەستێت، بەشێوەیەك کە ببنە بەڵگە لەسەر دەسەڵاتی خوای بالادەست و گەیشتن پێی و تێگەیشتن لەو سیفەتە بەرز و تەواوانەی کە هەیەتی و ببنە هۆی ئەوەی ئاڕاستەمان بکەن بەرەو باوەڕپێهێنان پێی و هەستکردن بە گەورەیی و تێگەیشتن لە جوانی ڕێکخستن و داناییەکەی و دەستەوستانکەری (إعجاز) ئەندازەکێشییەکەی.

قورئانی پیرۆزیش - کاتێك بانگمان دەکات بۆ ڕوانین لە دروستکراوەکان و سرووشت - خودی خۆی پێشنیاز ناکات بە سەرچاوەی زانستیی سرووشت، بەڵام ئاڕاستەمان دەکات بۆ ئەو زانستە بۆ ئەوەی دەستی مرۆڤ بگرێت بۆ گەیشتن بە ناسینی دروستکەر و هەستکردن بە یەکێتیەکەی و دڵنیابوون لەوەی کە ئەو هەموو سیفەتە تەواوەکانی لەخۆگرتووە و پاك و بێگەردە لە هەموو سیفەتە کەم و کورتەکان، بە هەموو ئەمانە توانا زانستییەکانی مرۆڤ و لێهاتووییە

عەقڵی و هزرییەکانی و ئامادەباشیە مەعریفییەکانی دروست دەکات، هەموو تواناکانی بۆ تێگەیشتن دەجوڵێنێت و بۆ ئەو کارە گرنگانەی پێی سپێردراوە، ئامادەی دەکات.

ئەگەر سرووش (وحي) یارمەتی بدات بۆ بەدەستهێنانی پاڵفتەبوون و پاکبوونەوە، لەبەر ئەوەی پاش یەکتاپەرستی، مەبەستێکی سەرەکی و گرنگە، ئەوا وردبوونەوەو تێڕوانین لە دروستکراوەکان و سرووشت بە دڵنیاییەوە یارمەتی دەدات لەسەر ئامادەکردنی بۆ ئاوەدانکردنەوە، بەڵام دەبێت تێڕوانینی بۆ دروستکراوەکان و سرووشت بەشێوەیەك بێت کە بزانێت ئەوانە بە فەرمانی خوای گەورە ڕام و ملکەچن و بە ڕێساو یاسایەکانی ئەو بەڕێوەدەڕۆن و دەجوڵێن، هەموو شتەکان لەم گەردوونەدا بە فەرمانی ئەو شێوەی خۆیان وەردەگرن، مرۆڤ ملکەچ و ڕامی نەکردوون و نابێت هەڵخەڵەتێت بەوەی کە هاتوونەتە بەردەستی و ملکەچکراون بۆی و خۆی بە گەورە بزانێت و بڵێ: ﴿إِنَّمَا أُوتِيتُهُ عَلَى عِلْمٍ عِنْدِي﴾. (القصص: ٧٨) مانای: ئەوانە بەهۆی زانست و زانیاری و نەخشە و عەقڵی خۆمەوە بەدیهاتوون.

یاخود وابزانێت ئەم ملکەچە بۆیان و ئەوکات ببێتە هاوەڵدانەر بۆ خودای گەورە، یان وابزانێت ئەم سرووشت و دروستکراوانە خۆیان بەڕێوە دەڕۆن و کەس دروستی نەکردوون و بەڕێوەیان نابات، ئەو کات ببێتە بێباوەڕ (مُلحد)، نەخێر پێویستە وابزانێت خوای گەورە ملکەچی کردوون و ڕامی هێناون و خستونیەتیە بەردەستی مرۆڤ و خودای ئەوان

وخودای مرۆڤ یەکە و مرۆڤ تـەنها کـاری جێنـشینی و ئاوەدانکردنـەوە و وەبەرهێنانی پیێ سپێردراوە. بۆ ئەم دەروازە گرنگە چەندین دەروازەی لاوەکی هەیە کە سرووش (وحي) ڕێنماییمان دەکات بۆیان، لەوانە:

* زانینی سەرەتای دروستبوون و چۆنیەتی پێکهێنانی بوونەوەران و گرنگترین کارەکانیان، خوای گەورە دەفەرموویێت: {أَولَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَـرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ والأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا وجَعَلْنَـا مِـنَ الْمَـاءِ كُـلَّ شَـيْءٍ حَيّ أَفَلاَ يُؤْمِنُونَ}. (الانبياء: ٣٠). مانای: ئایـا ئەوانـەی بێبـاوەڕ بـوون نەیانبینیوەو بۆیان روون نەبووەتەوە کە بەڕاستی ئاسمانـەکان و زەوی یەك پارچە بوون، پاشان لێکمان جیاکردنەوە، لە ئاویش هەموو شتێکی زیندوومان فەراهەم هێناوە، ئایا ئەوانە هەر باوەڕ ناهێنن (بەو ڕاستیانە و بەو دەسەڵاتە بێسنوورەی ئێمە)!؟.

هـەروەها دەفـەرمووێت: {واللَّـهُ أَنْبَـتَكُمْ مِـنَ الأَرْضِ نَبَاتًـا (١٧) ثُـمَّ يُعِيدُكُمْ فِيهَا وَيُخْرِجُكُمْ إِخْرَاجًا}. (نوح: ١٥، ١٦). مانای: هەر خوا خۆی ئێـوەی لــە خــاکی زەوی بــەدیهێناوە و پێیگەیانــدوون (١٧) پاشــان دەتانمرێنێت و دەتانخاتەوە نێوی. هەروەها بەیەکەوە گرێیان دەدات و دەفەرمووێت: {أَلَمْ تَرَوْا كَيْفَ خَلَقَ اللَّهُ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقًا (١٥) وجَعَـلَ الْقَمَرَ فِيهِنَّ نُورًا وجَعَلَ الشَّمْسَ سِرَاجًا}. (نوح: ١٧، ١٨)

مانـای: ئایـا سـەرنجتان نـەداوە چـۆن خـوا حـەوت چـین ئاسمـانی دروستکردوە؟! مـانگی کردووەتـە هـۆی ڕوونـاکی تیایانـدا و خۆریـشی داگیرساندووە.

**هەروەها ئەم دەروازەیە دەبێتە هۆی:**

* ئاشـكراكردنی ئـەو یاسـا وردانـەی گـەردوون هەیـەتی و هۆكـاری دروسـتكردنی خـوای گـەورە بـۆ دروسـتكراوەكان وەك، دەفـەرمووێت: {وهُوَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ والأَرْضَ بِالْحَقِّ ويَـوْمَ يَقُـولُ كُـنْ فَيَكُـونُ قَوْلُـهُ الْحَقُّ وَلَهُ الْمُلْكُ يَوْمَ يُنْفَخُ فِي الصُّورِ عَـالِمُ الْغَيْـبِ والـشَّهَادَةِ وَهُـوَ الْحَكِـيمُ الْخَبِيرُ} . (الانعام٧٣)

مانای: هەر ئەو زاتە ئاسمانـەكان و زەوی لەسـەر بنـچینە و بناغـەی حەق و ڕاستی دروسـتكردووە، هـەر ڕۆژێـك، هـەر كاتێـك، فـەرمان (بـە نەمان و لەناوچوونی بدات) بێ دواكەوتن، پێشدێت، فەرمان و گوفتـاری ئـەو زاتـە هەمیـشە ڕاسـت و بەجێیـە و ئەنجامـدراوە، لـەو ڕۆژەی فـوو دەكرێت بە كەڕەنا (صور)دا، دەسەڵات تەنها بۆ خوایە، هەر ئەو زانـای نهێنی و ئاشكرایە، هـەر ئـەویش خوایـەكی دانـا و بەئاگایـە (بـە هـەموو بەدی هێنراوەكانی).

هەروەها دەفەرمووێت: {ومَا خَلَقْنَا السَّمَاءَ والأَرْضَ ومَا بَيْنَهُمَا لاَعِبِينَ (١٦) لَوْ أَرَدْنَا أَنْ نَتَّخِذَ لَهْوًا لاَتَّخَذْنَاهُ مِنْ لَدُنَّا إِنْ كُنَّا فَاعِلِينَ} . (الانبیاء: ١٦، ١٧). مانای: ئێمە ئاسمـان و زەوی و هەرچـیش لەنێوانیاندایـە بـە گاڵتە (بێ مەبەست) دروستمان نەكردووە (١٦) ئەگەر بمانویستایە یاری و گەمەیەك بسازێنین، لەلای خۆمان دەمانسازاند، ئەگەر بڕیار بێ كاری وابكەین... .

مرۆڤ فەرمانی پێکراوە بیر لە دروستکردنی زەوی و ئاسمان بکاتەوە، بۆ ئەوەی لە هەموو ئەمانە تێبگات و پەردە لەسەر وردیی یاسا و ڕێسا ڕێکوپێکەکەکانی گەردوون و هۆکار و مەبەستەکانی دروستبونی لابدات و تاك و تەنیایی خوای گەورەی بۆ ڕوون ببێتەوە و لەوێوە بۆچوون و تێگەیشتنەکانی بۆ گەردوون و ژیان و مرۆڤ دروست بکات و دایبمەزرێنێت، تا ئەوکاتە بتوانێت بەتەواوەتی بە کاری ئاوەدانکردنەوە هەڵبستێت، ئەگینا دنیا بەنیسبەتی ئەو یاری و گاڵتەو گەپ و بێ هودە دەبێت، خودای گەورەش پاك و بێگەردە لەوە، خوای گەورە دەفەرمووێت: {أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لاَ تُرْجَعُونَ}. (المؤمنون: ١١٥). مانای: ئایا گومانتان وا دەبرد کە بەڕاستی ئێمە ئێوەمان بەبێ مەبەست دروستکردووە و ئێوە بۆ لای ئێمە ناهێنرێنەوە؟!.

هەروەها مرۆڤ بە بیرکردنەوە لەم دەروازەیە بۆی دەردەکەوێت کە ئەم یاسا ورد و دامەزراوانە مانای ئەوە نین کە ئەو دروستکراوانە هەتا هەتایی بەردەوام دەبن بەبێ کۆتایی، نەخێر، بەڵکو بڕیاریان بۆ دراوە کە دەبێت تا کاتێکی دیارییکراو هەبن، کەواتە یاسا وردەکانی و ئەو جوانییەی کە لە خۆی گرتووە، فراوانی و گەورەییەکەی هەرگیز سیفەتی هەمیشەیی پێنابەخشن، خوای گەورە دەفەرمووێت: {أَولَمْ يَتَفَكَّرُوا فِي أَنْفُسِهِمْ مَا خَلَقَ اللَّهُ السَّمَاوَاتِ وَالآرْضَ ومَا بَيْنَهُمَا إِلاَّ بِالْحَقِّ وأَجَلٍ مُسَمًّى وإِنَّ كَثِيرًا مِنَ النَّاسِ بِلِقَاءِ رَبِّهِمْ لَكَافِرُونَ}. (الروم: ٨)

مانای: ئایا ئەوە لە ناخی خۆیاندا بیریێکیان نەکردووەتەوە کە خوا ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی لەنێوانیاندا هەیە تەنها بە حەق و سنووردار نەبێ دروستی نەکردوون؟ لە ڕاستیدا زۆربەی خەڵکی بێباوەڕن بە گەیشتنە خزمەتی پەروەردگاریان. لەبەر ئەوەی کۆتایشی هەیە و تا کۆتاییەکی دیارییکراو دەڕوات، ئەمە سیفەتی ڕاستیەتی ـ کە پێی ڕاوەستاوە و دروستکراوە ـ لێناسەنێتەوە.

لەبەر ئەوەی مرۆڤ بەشێکی دروستکراوەکانە و کوڕی شەرعی سرووشتە، بۆیە نابێت بێئاگابێت لەوەی کە هەرشتێك بەسەر سرووشت و دروستکراوەکانی نێویدا بێت، ئەوا بەسەر ئەویشدا دێت، خوای گەورە دەفەرموویێت: {إِنَّ الَّذِينَ يُجَادِلُونَ فِي آيَاتِ اللَّهِ بِغَيْرِ سُلْطَانٍ أَتَاهُمْ إِنْ فِي صُدُورِهِمْ إِلاَّ كِبْرٌ مَا هُمْ بِبَالِغِيهِ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ إِنَّهُ هُو السَّمِيعُ الْبَصِيرُ (٥٦) لَخَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ النَّاسِ ولَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لاَ يَعْلَمُونَ}. (غافر: ٥٦،٥٧)

مانای: بەڕاستی ئەوانەی موجادەلە و گفتوگۆی سەرکەشانە دەکەن و بە نەشارەزایی لە ئایەتەکانی خوا دەدوێن بێئەوەی بەڵگەیەکی بەهێزیان پێبێت، ئەوانە تەنها لە سینەیاندا خۆبەزلزانین هەیە، بە مەرجێك هیچ کات ناگەنە ئەو ئامانجانەی هەیانە، کەواتە تۆ پەنا بگرە بە خوا لە شەڕی خوانەناسان، چونکە ئەو زاتە بیسەر و بینایە پێیان (٥٦) بەڕاستی دروستکرنی ئاسمانەکان و زەوی لە دروستکردنی خەڵکی

زۆر گەورەو گرنگترە، بەڵام زۆربەی خەڵکی ئـەم راسـتییانە تێناگـەن و پەی پێنابەن و نایزانن.

ئەوان گەر شتێك بزانن ـ لە كاتی بێباوەڕییان بە سـرووش (وحـی) ـ ئەوا وەك خوای گەورە دەفەرموویت: {يَعْلَمُونَ ظَاهِرًا مِـنَ الْحَيَـاةِ الـدُّنْيَا وهُمْ عَنِ الْآخِرَةِ هُمْ غَافِلُونَ} . (الروم: ٧). مانای: ئەوانە هـەر ڕواڵـەت لـە ژیانی دنیا بەدی دەکەن، لە بەرانبەر قیامەتیشەوە بێئاگان.

هەروەها بیرکردنەوە لەم دەروازەیە و وردبوونەوە لێـی، وا لـە مـرۆڤ دەکات هەست بەو یەکانگیرییە (تلازم) سەیرە بکات کە خوای گـەورەی بەدیهێنەری شێوەکێش (المصور) ـ جلّ شأنه وعزت قدرتـه ـ لـە نێـوان زانست و باوەڕدا دروستی کردووە.

کاتێك زانـست جـودا دەبێتـەوە لـەباوەڕ، جـاری وا هەیـە زیانەکـەی گەورەتر و زیاتر دەبێت لـە قازانجەکـەی، خـوای گـەورە دەفـەرموویت: {وقَالَ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ والْإِيمَانَ لَقَدْ لَبِثْتُمْ فِي كِتَابِ اللَّهِ إِلَـى يَـوْمِ الْبَعْـثِ فَهَذَا يَوْمُ الْبَعْثِ ولَكِنَّكُمْ كُنْتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ} . (الروم: ٥٦)

مانای: ئەوانەی زانیاری و ئیمانیان پێبەخشرا بوو، دەڵێن: سوێند بە خودا ئێوە بە ڕاددەی ئەوەی خوا بڕیاری لەسەر بـووە ماونەتـەوە ـ لـە دنیادا و لە جیهانی بەرزەخدا ـ تا ڕۆژی زیندوبوونەوە، جـا ئەمـە ڕۆژی زیندوبوونەوەکەیە، بەڵام ئێوە بەم ڕاستیەتان نەدەزانی و بڕواتان پێـی نەبوو.

بەڕاستی قورئانی پیرۆز کاری کردووە بۆ دروستکردنی پتەوترین و بەهێز ترین و باشترین پەیوەندی لە نێوان مرۆڤ و گەردوونی دروستکراو و ڕامکراو لەلایەن پەروەردگارەوە بۆ ئەوەی ململانێ، یان پشگوێخستن، یان پەیوەندییەکی خراپ و لەرزۆك لە نێوانیاندا ـ مرۆڤ و گەردوون ـ دروست نەبێت، ئەوکات حیکمەتی زۆر و گرنگ لەدەست بچێت، کە هەرچەندە لەوانەیە کاریگەرییان نەبێت لەسەر ڕامکردنی سرووشت، یان گەردوون کە ملکەچن بۆ یاسا و ڕێساکانی خوای گەورە کە هەرگیز گۆڕانکارییان بەسەر دا نایەت، بەڵام ـ بەلایەنی کەمەوە ـ مرۆڤ بێبەش دەبێت لەو هەستە بەرزانەی کە وای لێدەکەن هەست بە خۆشەویستی و ڕێزی ژینگەکەی و ئەوەی کە تیایدایەتی بکات و ئاشتی و ئارامی بۆ دەروونی خۆی و چواردەوری خۆی بەدیبهێنێت، بێبەشی دەکات لەوەی هەست بە ڕێزی نیعمەتە بێ ژمارەکانی پەروەردگاری لەسەری بکات، کاتێك کە هەموو ژینگە و دەوروبەری خستووەتە بەردەستی و ڕامی کردووە بۆی و فێری کردووە کە چۆن سوودی لێببینێت و بە کاری جێنشینی و ئاوەدانکردنەوە هەستێت و ڕاستی و دادپەروەری بەرپا بکات تیایدا و بیباتە نێو قافڵەی بەندایەتی و تەسبیحاتکردن بۆ ئەو خوایەی دروستی کردووە.

مرۆڤ پێویستی بە زاڵبوون نییە بەسەر دروستکراوەکان و سرووشتدا، بۆچی پێویستی پێبێت لەکاتێکدا هەموویانی لەلایەن خوای گەورەوە بۆ ملکەچ و ڕام کراوە، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرمووێت:

**{اللَّهُ الَّذِي سَخَّرَ لَكُمُ الْبَحْرَ لِتَجْرِيَ الْفُلْكُ فِيهِ بِأَمْرِهِ ولِتَبْتَغُوا مِنْ فَضْلِهِ ولَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ}**. (الجاثية: ١٢)

مانای: خوا ئەو زاتەیە کە دەریای بۆ ڕام کردوون تا کەشتی بە فەرمانی ئەو هاتوچۆی پێدا بکات، تا بچن بەدەم بەخشش و بەهرەکانیەوە و دەستانکەوێت (لە بازرگانی و ڕاوەماسی و دەرهێنانی گەوهەر و مرواری..و هتد)، بۆ ئەوەش سوپاسگوزاریی خوا بکەن.

هەروەها دەفەرمووێت: **{ولَقَدْ مَكَّنَّاكُمْ فِي الأَرْضِ وجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَايِشَ قَلِيلًا مَا تَشْكُرُونَ}**. (الاعراف: ١٠)

مانای: سوێند بە خوا ئێمە ئێوەمان لەم زەویەدا نیشتەجێ کرد و دەسەڵاتمان پێبەخشین و هۆکارەکانی ژیانمان (لە خواردن و خواردنەوە و هۆکانی گواستنەوە و پۆشاکی ناوماڵ و ئاو و هەواو...هتد) تیایدا بۆ فەراهەمهێنان، کەچی لە بەرانبەر ئەو هەموو ناز و نیعمەتە بێ شومارەدا سوپاسی کەمی نیعمەتەکان دەکەن، یان کەمتان سوپاسگوزارن.

کەواتە مرۆڤ داوای لێکراوە هەموو ئەمانە بۆ خۆی وەبەربهێنێت و سوودی لێببینێت، ئەگەر ئەوەی نەکرد، ئەوە ئەو ئەرکەی کە لەسەر شانیەتی لە گەردووندا جێبەجێی نەکردووە، چونکە ئاوەدانکردنەوە بەشێکە لە بەندایەتی، هەر بەشێك لە بەشەکانی سرووشت پشتگوێ بخرێت، مانای ئەوەیە ئەو بەشە مردووە، یان کوژراوە، خوای گەورە

دەفەرمووێت: **{وآيَةٌ لَهُمُ الآرْضُ الْمَيْتَةُ أحْيَيْنَاهَا وأخْرَجْنَا مِنْهَا حَبًّا فَمِنْهُ يَأْكُلُونَ}** (يس: ٣٣)

مانای: لە بەڵگە و نیشانەی ئاشکرای خوا بۆ ئەو خەڵکە ئەوەیە: ئەو زەویە مردووە بەهۆی ئاوی بارانەوە زیندووی دەکەینەوە، دانەوێڵەی لێدەردەهێنین و دەبێتە ڕۆزی بۆیان و لێی دەخۆن.

بۆیە فوقەهایەکان باسێکی سەربەخۆیان لە کتێبە فیقهیەکاندا داناوە و ناویان لێناوە (زیندوکردنەوەی مردووەکان) مانای: ئاوەدانکردنەوەی ئەو زەوییانەی پشتگوێ خراون و کشتوکاڵیان تێدا نەکراوە و خانوویان لەسەر نەکراوە و وەبەرهێنانی تێدا ناکرێت. قورئانی پیرۆز ئەو پەیوەندییە دڵسۆزانەیەی لە نێوان مرۆڤ و پێکهاتەکانی گەردووندا دروستکردووە، ئەو پەیوەندییەشی بە تەنها لەگەڵ ژینگەی دەوروبەری، یان ژینگە ڕاستەوخۆیەکەی مرۆڤ دروست نەکردووە، بەڵکو ئەو پەیوەندییە دڵسۆزانەیەی ڕۆژ و مانگ و ئەستێرەکانیشی گرتووەتەوە، خوای گەورە دەفەرمووێت: **{وجَعَلَ الْقَمَرَ فِيهِنَّ نُورًا وجَعَلَ الشَّمْسَ سِرَاجًا}**. (نوح: ١٦)

مانای: مانگی کردووەتە هۆی ڕووناکی تیایاندا و خۆریشی داگیرساندوە.

هەروەها دەفەرمووێت: **{وهُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ النُّجُومَ لِتَهْتَدُوا بِهَا فِي ظُلُمَاتِ الْبَرِّ وَالْبَحْرِ قَدْ فَصَّلْنَا الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ}**. (الانعام: ٩٧)

مانای: هەر ئەو زاتە، ئەستێرەی بۆ فەراهەم هێناون تا ببێتە هۆی ڕێنوییتان لەنێو تاریکییەکانی سەر ڕووکاری وشکانی و دەریاکاندا، بەڕاستی ئێمە نیشانە و بەڵگەی زۆرمان (لەسەر دەسەڵاتی خۆمان و ڕێکوپێکی کارمان) ڕوونکردووەتەوە بۆ کەسانێك کە پێی بزانن و لێی تێبگەن.

قورئان ئەو مرۆڤە جێنشینکراوە و بەرپرسیارە لە ئاوەندانکردنەوە و بەندایەتی بۆ خوای گەورە ئاگادار دەکاتەوە لەوەی پێویستە لەسەری هەموو ئەو توانایەی خوای گەورە پێی بەخشیوە بۆ دروستکردنی پەیوەندییەکانی لەگەڵ گەردوون، بەشێوەیەکی گونجاو، بەکاری بهێنێت. خوای گەورە دەفەرموویێت: **{واللَّهُ أَخْرَجَكُمْ مِنْ بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ لاَ تَعْلَمُونَ شَيْئًا وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ والأَبْصَارَ والأَفْئِدَةَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ}**. (النحل: ٧٨). مانای: خوا ئێوەی لە سکی دایکتان دەرهێناوە بێ ئەوەی هیچ شتێك بزانن، ئینجا دەزگای بیستن و بینین و تێگەیشتنی بۆ دابینکردوون، بۆ ئەوەی سوپاسگوزاری بکەن.

بۆیە مرۆڤ زۆر زۆر پێویستی بەو هۆکار و ئامرازو توانایانە هەیە، جا بۆ ئەوەی ئەو توانایانەی دەمەزەرد بکاتەوە و دووقاتیان بکاتەوە، پێویستی بەوە هەیە وردبێتەوە لە زەوی و گەردوون، چونکە ئەو کاتە هەردووکیان قازانج دەکەن، بەو هۆیەی، تەماشاکردن و وردبوونەوە و بیرلێکردنەوەیان وا لە مرۆڤ دەکات بتوانێت بە جوانی گەردوون بۆ خۆی بەکاربهێنێت و توناکانی پەرەپێبدات، تێڕوانین و وردبوونەوەیشی لە

گـــەردوون توانـــای ئـــەو ئـــامراز و هۆکارانـــە چـــەند قـــات دەکاتـــەوە، بەپێـچەوانەشەوە، وازهێنـان لـە بیرکردنـەوە و تێڕامـان دەبێتـە هـۆی تەنبەڵی و ساردبوونەوە و بێتاقەتی، یان سەردەکێشیٚ بۆ لادان.

## ٢. دەروازەی بایەخپێدان:

ئەم دەروازەیەش یەکێکە لە دەروازەکانی خوێندنـەوەی گـەردوون و زۆر جیـاواز نییـە لەگـەڵ (دەروازەی دروسـتکردن)، ئەگـەر دەروازەی دروستکردن پەلکێشمان بکات بۆ تێڕوانین لە دروستکراوەکان کە چـۆن خوای پەروەردگار ئەم دروستکراوانەی لـە سـەرەتاوە دروسـتکردووە و پەلکێشمان بکات بۆ زانینی مەبەست لێیان و چۆنیەتی بەڕێوەچـوونیان و زانینی کاتی کۆتاییان، ئـەوا دەروازەی (بایەخپێـدان) دەمانگەیەنێتـە ئەوەی کە جـوان بڕوانینـە یاسـا وردەکـانی گـەردوون و پـەردە لەسـەر جوانیی و ڕێکوپێکی کار و دروستکراوەکانی پەروەرگار لەم گەردوونەدا لاببەین و بڕوانینە ئەو یاسا و ڕێسا جوانانەی کە هـەرگیز گۆڕانکارییـان بەسەردا نایەت، لە هەمانکاتیشدا ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە خوای گەورە چـەندە ڕێـزی لـە مـرۆڤ گرتـووە، بـەوەی ئـەو هـەموو بایەخـەی پێداوە.

ئـەم جـۆرە لــە تێڕوانینـــە، عــەقڵی مــرۆڤ پەرەپێــدەدات و لەســەر تێڕوانینی لۆژیکیی بۆ هەموو ئەو شتانە دەوروبەری خۆی ڕایدەهێنێت، فێــری دەکــات چــۆن مەبەســت و یاســا گــشتییەکان و حیکمــەت و

ئامانجەکان لـە سەرچـاوەکانیانەوە بـە ڕێگەکانیـشیانەوە بدۆزێتـەوە و باوەڕ بە خوای خۆی بهێنێت و متمانـە بـە خـوای خـۆی پەیـدا بکـات و بزانێت کە گەردوون تەنها ئەوەندە نییـە کـە لـە چـەند تـەنێکی پارچـە پارچە، یان لـە چـەند بەشـێکی لەیەکدی جـودا پێکهێنرابێـت و بـەس، بەڵکو، پێویستە بزانێت و ببینێت کە چۆن بەجوانی لە یەکدی گرێدراوە و بە وردی و بە یاسا و ڕێسای یەکگرتوو، ڕێکخـراوە. ئەمـە وا لـە مـرۆڤ دەکات کە بە (دیدێکی گشتی) بۆ گەردوون و ژیان بڕوانێت.

فەیلەسـووفەکان و قوتابخانـە فەلـسەفییەکان بەدرێـژایی مێـژوو زۆر خۆیـان مانـدوو کـردووە و بـەردەوام و ئێـستاش زۆرێکیـان لـە هـەوڵی ئـەوەدان ئـەو پڕۆگرامـە، یـان ئـەو شـێواز و ئامرازانـە بدۆزنـەوە کـە بەهۆیەوە بتوانرێ هەموو پێکهاتـەکانی گـەردوون بـۆ یـەك سەرچـاوە و بنەما بگێڕدرێتەوە و بگەنە پڕۆگرامێك، یان یاسایەکی گشتی مەعریفی، یـان نموونەیـەکی مـەعریفی کـە بتوانێـت ڕاڤـەی دیـاردە گـەردوونی و سرووشـتیەکان بکـات، بەشـێوەیەکی گـشتی و گـشتگیر، چـونکە هـیچ گومان لـەوەدا نییـە زۆرێـك لـە دیـاردە سرووشـتیەکان تائێـستاش زانـا ماددییـەکان ـ بەتایبـەتی ـ بـەبێ سـەروبەری و بـە کوێرانـە ڕاڤـەی بـۆ دەکەن و زۆر زۆر هەوڵدەدەن لەو بارەیەوە بە ئەنجام بگەن، بەڵام لێـی تێناگەن و نایانگەیەنێتە ئەنجامی دڵنیایی، ڕەنگە هۆکاری یەکـەمین بـۆ ئەوە لە وەدا خۆی ببینێتەوە کە ئەو زانا ماددییانە ئاوڕ نادەنە بۆ ئـەو یاسـا ورد و بایەخـە زۆرە خواییـەی لەپـشت ئـەو دیـاردە گـەردوونی و

سرووشتیانەوە هەیـە، ئـەوان تـەنها تێڕوانینـەکانیان کورتکردووەتـەوە لەسـەر ڕوانـین بـۆ دیـاردە بەرجەسـتەکان کـە وایـان لێـدەکات تـەنها پابەندبن بە (مشتومڕ لە نێـوان پێکهاتـەکانی سرووشـتی مـاددیی)دا[1]،

---

(١) لە گرفتەکانی شارستانیەتی نوێی ڕۆژئاوا تێڕوانینیەتی بۆ مانا و ڕاسـتی عـەقل، چـونکە پێیوایە هەمیشە عەقڵ پێچەوانەیە لەگـەڵ دڵ، ئـایین، خـودا. ئـەوەش پێناسـەیەکە کـە ملکـەچ دەبێت بۆ دوولایەن کە هیچ ئیشمان پێیان نییە، چونکە عەقڵ بـە تێگەیـشتنی قورئـانیی شـتێك نییە لە دەرەوەی دڵ بێت و جیاواز بێـت لێـی و هـیچ کـات عـەقڵ لەگـەڵ دڵ و بـاوەڕ پێـچەوانە ناوەستێتەوە، قورئانی پیرۆز لە ڕێگەی ئایەتە گشتگیر و تەواوەکانیەوە ئەم تەواوکارییـەمان بـۆ باس دەکات، بڕوانە فەرمایشتی پەروەردگار: {ولَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِنَ الْجِنِّ وَالْإِنْسِ لَهُمْ قُلُوبٌ لاَ يَفْقَهُونَ بِهَا ولَهُمْ أَعْيُنٌ لاَ يُبْصِرُونَ بِهَا ولَهُمْ آذَانٌ لاَ يَـسْمَعُونَ بِهَـا أُولَئِـكَ كَالأَنْعَـامِ بَـلْ هُـمْ أَضَـلُّ أُولَئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ}. (الاعراف١٧٩)

مانای: سوێند بـەخوا، ئێمـە زۆر لـە پـەری (جـن) و ئادەمیزادمـان بـۆ دۆزەخ دروسـت کردووە، چونکە ئەوانە دەزگای دڵیان هەیە و کەچی نایانەوێت حـەقی پـێ تێبگـەن، چاویـشیان هەیە کەچی حەقی پێ نابینن، گوێیان هەیە کەچی حەقی پێ نابیستن، ئـا ئەوانـە وەکـو ئـاژەڵ وان ـ لە شوێنکەوتنی ئارەزوودا ـ بـەڵکو ئەوانـە وێڵتریـشن، ئـا ئەوانـە هـەر غافـڵ و بێئاگـان لـە حەق.

بشڕوانە فەرمایشتی پەروەردگار: {أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُـوبٌ يَعْقِلُـونَ بِهَـا أَوْ آذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا فَإِنَّهَا لاَ تَعْمَى الأَبْصَارُ ولَكِنْ تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ}. (الحج: ٤٦)

مانای: ئایا ئەوانە لەسـەر زەویـدا نەڕۆیـشتوون بـە دڵ و دەروونێکـی هۆشـیارەوە تـا بیرێـك بکەنــەوە... (کــوا لــە کــوێن خــەڵکانی ڕابــردوو؟ ئــەو شــارانە بــۆ کــاولکران؟ کــێ ئێمــەی دروســتکردووە؟ ئامــانج لــە ژیــان چــیە؟) یــان خــاوەنی گــوێ و دەزگــای بیــستن نــەبوون بەسەرهاتەکانیان ببیستن و لێکیبدەنەوە، وەنەبێت چاویان کوێر بووبێت، بەڵکو ئەو دڵانـە کـوێر دەبن کە لە سینەکانیاندایە، چونکە هەر ڕواڵەت دەبینن و ناوەڕۆك لێکنادەنەوە.چەندین ئایـەتی دیکەش کە بە ڕوونی ئاماژەیان بۆ ئەم بابەتە کردووە.

بـەڵام وردیـی بـەڕێوەبردن و یـەکێتی یاسـا و ڕێکخـستنی ئـەو دیـاردە گـەردوونی و سرووشـتییانە هەسـتی پیناکرێـت ئەگـەر زانـای توێـژەر باوەڕی بە بوونی بەڕێوەبەری تاك و تەنیا و حیکمەت و توانا ڕەهاکـەی نـەبێت، چـونکە ئـەو باوەڕەیـە توێـژەر دەپارێزێـت لـە سەرلێـشێوان و کەوتنە نێو هەڵـەوە، خـوای گـەورەش نموونـە دەهێنێتـەوە بـە بـاوکی پێغەمبەران ئیبراهیم (سەلامی خـوای لێبێـت، کاتێـك بـە وردی سـەیری کۆمەڵێك لە دیاردە گەردوونییـەکان و بوونـەرانی کـرد و لێیـان ڕامـا بـۆ ئــەوەی لەلایەکــەوە جێگــە و ڕاســتی هەریەکــەیانی بــۆ دەربکــەوێت، لەلایەکی دیکەشەوە هەڵوێستی خـۆی لـە بەرانبـەر هەریەکـەیان دیـاری بکات، خوای گەورە دەفەرمووێت: **{فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ اللَّيْلُ رَأَى كَوْكَبًا قَالَ هَذَا رَبِّي فَلَمَّا أَفَلَ قَالَ لاَ أُحِبُّ الْآفِلِينَ (٧٦) فَلَمَّا رَأَى الْقَمَرَ بَازِغًا قَالَ هَذَا رَبِّي فَلَمَّا أَفَلَ قَالَ لَئِنْ لَمْ يَهْدِنِي رَبِّي لأَكُونَنَّ مِنَ الْقَوْمِ الضَّالِّينَ (٧٧) فَلَمَّا رَأَى الشَّمْسَ بَازِغَةً قَالَ هَذَا رَبِّي هَذَا أَكْبَرُ فَلَمَّا أَفَلَتْ قَالَ يَا قَوْمِ إِنِّي بَرِيءٌ مِمَّا تُشْرِكُونَ (٧٨) إِنِّي وجَّهْتُ وُجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَاوات وَالأَرْضَ حَنِيفًا ومَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ}**. (الانعام: ٧٦-٧٩)

---

کەواتە قورئانی پیرۆز عەقڵی کردووە بـە بەشـێك لـە دڵ بـە ڕێکخـستنێکی بێوێنـە لـە نێـوان پێکهاتەکانی مـرۆڤ لـە عـەقڵ و دڵ و روحـدا، بۆیـە بـەم تێڕوانینـە، هـەر جیاوازییـەك لـە نێـوان بەشەکانی مرۆڤ لە (عەقڵ و دڵ و زانست و باوەڕی بەخودا) ڕەددەکەینەوە.

ماناى: کاتێك شەو باڵى کێشا بەسەر ئیبراهیمدا، ئەستێرەیەکى ـ گەشى گەورە ـ ى بینى، بۆیە وتى: ئەمە پەروەردگارمە، کاتێك ئەستێرەکەى لێ ئاوا بوو، وتى: من شتى لەبەرچاوونبووم خۆشناوێت و ناپەرستم (٧٦) پاشان کاتێك مانگى بینى هەڵهات، وتى: ئەمەیان پەروەردگارمە، کاتێك ئەویش ئاوا بوو، وتى: سوێند بێت بە خوا ئەگەر پەروەردگارم هیدایەتم نەدات ئەوە بێگومان لە ڕیزى دەستەى گومڕایان دەبم (٧٧) پاشان کاتێك خۆرى بینى هەڵهات، وتى: ئەمەیان پەروەردگارمە، ئەمە گەورەتریشە، کاتێك ئەویش ئاوا بوو، وتى: ئەى خزمینە، بەڕاستى من بەریم لەو شتانەى ئێوە کردووتانە بە هاوەڵ و هاوبەش بۆ پەروەردگارى ڕاستەقینە (٧٨) بەڕاستى من ڕووى خۆم و دڵم لە پەرستندا کردووەتە ئەو زاتەى ئاسمانەکان و زەوى فەراهەم هێناوە، لەکاتێکدا ڕووم لە هیچ شتێکى دیکە ناکەم، بە دڵنیایى تەواویشەوە دەڵێم کە: هەرگیز من لە ڕیزى هاوبەشدانەر و هاوەڵگەراندا نیم (٧٩).

گەورەمان ئیبراهیم (سەلامى خواى لێبێت) لە ناخیدا ـ گرفت و کێشەیەکى ـ هەبوو، لەوێوە دەریخست کاتێك کە گەلەکەى بینى بەندایەتییان بۆ چەند بت و داتاشراوێك دەکرد کە باوکى بۆى دروست دەکردن و پێى دەفرۆشتن، ویستى چارەسەرێك بۆ ئەم گرفتەى کە خەوى لە چاوى زڕاندبوو، بدۆزرێتەوە، بە ئاڕاستەکردنى پرسیار لە باوکى (ئازەر)، دروستکەرى بتەکان دەستیپێکرد، بە باوك و گەلەکەى

وت: **{... مَا تَعْبُدُونَ (٧٠) قَالُوا نَعْبُدُ أَصْنَامًا فَنَظَلُّ لَهَا عَاكِفِينَ (٧١) قَالَ هَلْ يَسْمَعُونَكُمْ إِذْ تَدْعُونَ (٧٢) أَوْ يَنْفَعُونَكُمْ أَوْ يَضُرُّونَ}**. (الشعراء: ٧٠-٧٣)

ماناى: ئەوە ئێوە چی دەپەرستن؟!(٧٠) وتیان: ئاشکرایە، ئێمە کۆمەڵێك بت دەپەرستین و بەردەوام دەوروخولیان دەدەین (٧١) ئیبراهیم وتی: ئایا کاتێك کە هانا و هاواریان بۆ دەبەن و دوعاو نزا دەکەن، گوێیان لە ئاه و ناڵەو داخوازییەکانتان هەیە؟! (٧٢) یاخود دەتوانن ئەوانە قازانجێك، یان زیانێکتان پێبگەیەنن؟ (٧٣).

ئەوان وەڵامێکی تەواو و قایلکەریان پێ نەبوو، جگە لەو وەڵامە خوار و خێچە دووبارەیە نەبێت کە هیچ کەسی پێ قایل و دڵنیا نابێت، کە بریتی بوو لە (شوێنکەوتنی باووباپیران)، خوای گەورە لەبارەیانەوە دەفەرموێت: **{قَالُوا بَلْ وَجَدْنَا آبَاءَنَا كَذَلِكَ يَفْعَلُونَ}**. (الشعراء:٧٤)

ماناى: باووباپیرانمان بینیوە ئاوایان کردووە.

بۆیە ئیبراهیم (دروودی خوای لەسەر بێت) ڕوو دەکاتە مەلەکوتی ئاسمانەکان و زەوی - بەهۆی تەوفیقی خوایی - بۆ ئەوەی بیگەیەنێ بە دەرمانی سارێژکەر و ڕزگاری بێت لەو گرفت و کێشە هزرییەی بۆی دروست بووە.

ئیبراهیم (دروودی خوای لەسەر) ئەو گرفتەی لەلای دروست بوو بوو کردی بە ژمارەیەك پرسیاری بەش بەش، یان ژمارەیەك پرسیاری لاوکیی، لە مەسەلەی ئەستێرەکان ڕوانیە هەردوو دیاردەی ئاوابوون -

دیارنەمان و کەموکوڕی ـ لەدوای هەڵهاتن و دەرکەوتن و تیـشکدانەوە و ڕوونـاکی بەخـشین، هەسـتی بـەوە کـرد کـە هەریـەك لـە ئـاوابوون و کـەموکوڕی و دیارنـەمان نابێـت سـیفەتی خواوەنـد بـن، چـونکە چـۆن دروستکراوەکانی بەڕێوەببات، لەکاتێکا کە ئـەم سـیفەتانەی تێـدابێت؟ کێ هەستێت بە بایەخدان بەم بوونەوەرە کاتێك کە ئەو ئـاوابوو و دیـار نـەما؟ ئەوانـە پرسـیارەکانی بـوون لـەبارەی دەسـەڵات و خاوەنـدارێتی ئاسمانەکان، پاشان ئاوڕی دایەوە بۆ دەسەڵات و خاوەنـدارێتی زەوی و پرسـیاری لـە گەلەکـەی و بـاوکی کـرد دوای ئاڕاسـتەکردنی پرسـیاری سەرەکی، خوای گەورە دەفەرموویت: {إِذْ قَالَ لأَبِيهِ وَقَوْمِهِ مَا تَعْبُدُونَ (٧٠) قَالُوا نَعْبُدُ أَصْنَامًا فَنَظَلُّ لَهَا عَاكِفِينَ (٧١) قَالَ هَلْ يَسْمَعُونَكُمْ إِذْ تَدْعُونَ (٧٢) أَوْ يَنْفَعُونَكُمْ أَوْ يَضُرُّونَ (٧٣) قَالُوا بَلْ وَجَدْنَا آبَاءَنَا كَذَلِكَ يَفْعَلُونَ (٧٤) قَالَ أَفَرَأَيْتُمْ مَا كُنْتُمْ تَعْبُدُونَ (٧٥) أَنْتُمْ وَآبَاؤُكُمُ الأَقْدَمُونَ (٧٦) فَإِنَّهُمْ عَدُوٌّ لِي إِلاَّ رَبَّ الْعَالَمِينَ (٧٧) الَّذِي خَلَقَنِي فَهُوَ يَهْدِينِ (٧٨) وَالَّذِي هُوَ يُطْعِمُنِي وَيَسْقِينِ (٧٩) وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ (٨٠) وَالَّذِي يُمِيتُنِي ثُمَّ يُحْيِينِ (٨١) وَالَّذِي أَطْمَعُ أَنْ يَغْفِرَ لِي خَطِيئَتِي يَوْمَ الدِّينِ (٨٢) رَبِّ هَبْ لِي حُكْمًا وَأَلْحِقْنِي بِالصَّالِحِينَ (٨٣) وَاجْعَلْ لِي لِسَانَ صِدْقٍ فِي الآخِرِينَ (٨٤) وَاجْعَلْنِي مِنْ وَرَثَةِ جَنَّةِ النَّعِيمِ (٨٥) وَاغْفِرْ لأَبِي إِنَّهُ كَانَ مِنَ الضَّالِّينَ (٨٦) وَلاَ تُخْزِنِي يَوْمَ يُبْعَثُونَ (٨٧) يَوْمَ لاَ يَنْفَعُ مَالٌ وَلاَ بَنُونَ (٨٨) إِلاَّ مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ}. (الشعراء: ٧٠ـ٨٩).

مانای: کاتێك ئیبراهیم بـه بـاوکی و گەلەکـەی وت: ئـەوە ئێـوە چـی دەپەرستن؟! (٧٠) وتیان: ئاشکرایە ئێمە کۆمـەڵێك بـت دەپەرسـتین و بەردەوام دەوروخولیان دەدەین (٧١) ئیبراهیم وتی: ئایا کاتێك کە هانا و هاواریـان بـۆ دەبـەن و دوعـاو نـزا دەکـەن گوێیـان لـە ئـاه و ناڵـە و داخوازییەکانتان هەیە؟! (٧٢) یاخود دەتـوانن ئەوانـە قازانجێـك، یـان زیانێکتـان پێبگەیـەنن؟ (٧٣) وتیـان: باووباپیرانمـان بینیـوە ئاوایـان کردووە (٧٤) ئیبراهیم وتی: باشە ئاخر ئێوە نابینن چی دەپەرستن؟! (کـــەی ئەوانـــە شایـــستەی پەرســـتنن) (٧٥) بەڕاســـتی ئێـــوەش و باووباپیرانی دێرینیـشتان بەهەڵەداچـون (٧٦) بێگومـان هـەموو ئەوانـە دوژمنـــی مـــنن، بـــە دوژمنـــی خۆمیـــان دەزانم، جگـــە لـــە پـــەروەردگاری جیهانەکان (٧٧) ئەوەی دروستی کردووم، هەر ئەویش ڕێنموییم دەکات ـ بۆ بەختەوەری هەردوو جیهان ـ (٧٨) ئـەو زاتـەی کـە خـۆی خـۆراکم پێدەبەخـشێت و تینویـەتیم دەشـکێنێت (٧٩) کـاتێکیش نـەخۆش دەکەوم، ئەوە، هەر ئەو چارەسەرم دەکات و شیفام بۆ دەنێرێـت (٨٠) هەر ئەویش دەممرێنێـت و لـەوەودواش زینـدووم دەکاتـەوە (٨١) هـەر ئەوە ئومێدم پێیەتی کە لە گوناهم خۆش ببێت لە ڕۆژی دواییدا (٨٢) ـ ئیبراهیم نزای کرد و وتی ـ: پەروەردگارا زانیاری و دانایی و دەسـەڵاتی تەواوم پێببخشە و بمگەیەنە ڕیزی چاکەکاران (٨٣) پەروەردگارا، یادی خێرم لەسـەر زاری نـەوەکانی داهـاتوودا بهێڵـەرەوە (٨٤) بمگێـڕە لـەو کەسانەش کە بەهەشتی پڕ لە نـاز و نیعمـەت بەدەسـتدەهێنن و دەبنـە

خاوەنی (٨٥) لە باوکیشم خۆش ببە، بەڕاستی ئەو لە ڕیزی گومڕاکانـدا بوو (٨٦) لە ڕۆژی زیندووبوونەوەی ئەو خەڵکەدا شەرمەزار و خەجاڵەتم مەکە (٨٧) ئەو ڕۆژەی نە ماڵ سوود دەبەخـشێت و نـە منـداڵ و نـەوە (٨٨) مەگەر کەسێك بە دڵ و دەروونـی پـاك و بێگـەرد و پـڕ لـە ئیمـان گەیشتبێتەوە پەروەردگاری (٨٩).

لێرەوە، دوای ئەوەی خۆی زۆر ماندوو کرد لە تێـڕوانینی لـۆژیکی و عەقڵی لە خاوەندارێتی و دەسەڵاتی ئاسمانەکان و زەوی، خوای گـەورە دەفەرمووێت: **{وَكَذَٰلِكَ نُرِي إِبْرَاهِيمَ مَلَكُوتَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَلِيَكُونَ مِنَ الْمُوقِنِينَ}**. (الانعام: ٧٥). مانای: بەو شێوەیەش دەسەڵاتی تۆکمـەمان لە ئاسمانەکان و زەویدا نیشانی ئیبراهیم دەدەین بۆ ئەوەی بێتە ڕیـزی دڵنیاکانەوە.

ئەو کاتە خۆی بەری کرد لە خواوەندەکانی باوك و گەلەکەی و ڕووی کرد خوای خۆی، ئەو خوایەی ئاسمانەکان و زەوی بەدیهێنانەوە، لایـدا لە هەموو ئەو ئایین و بیروباوەڕانەی لـەو کاتـە هـەبوون، بـەرەو ئـایینی ئیسلام و ڕووی خۆی کردە خودای جیهان و خۆی ڕادەسـتی ئـەو کـرد، بەمەش گەیشتە پلەی یەکتاپەرستی خوایەتی (توحيد الألوهية) و پلەی یەکتاپەرستی لە ڕووی بەڕێوەبردن (توحيد الربوبية).

ئەگەر توێـژەرەکان بەڕاسـتی لـە دەروازەی بایەخپێـدان تێبگـەن و هێماو هێڵـەکانی ئـەو یاسـا و ڕێـسا جـوان و بێوێنـە و موعجیزەیـان بـۆ دەربکەوێت کە پەرەردگار ئەم گەردوونـەی پـێ بـەڕێوە دەبـات، ئـەوە

بـەهێزترین پاڵنـەریان لـە لادروسـت دەبێـت بـۆ توێژینـەوەی جـددی و بەردەوام لەسەر دۆزینەوەی نهێنیەکانی گەردوون و توێژینەوە لەسەری و گەیشتن بەو پەیوەندیی و یاسایانەی کە ڕێکخستنی گەردوونی لەسـەر ڕاوەسـتاوە، توێـژەری بـاوەڕداریش کاتێـك ناتوانێـت ئەڵقەیـەك لـە ئەڵقەکانی ئەم یاسایانە لە دیاردەیەك لە دیاردەکاندا بدۆزێتـەوە، ئـەوە بەهیچ شێوەیەك ئەو بەرنامـە و پڕۆگرامـە زانسـتییەی بـەکاری هێنـاوە تۆمەتبار ناکات و نکوڵی لە بوونی یاسایەکان ناکات، تەنها لەبەر ئەوەی ئـــەو لـــەو دیاردەیـــەدا دەســـتی لەســـەر ئـــەو ئەڵقەیـــە دانـــەناوە و نەیدۆزیوەتەوە، چونکە ئەو دەزانێت کە نەدۆزینەوە بەڵگە نییە لەسـەر نـــەبوون، بۆیـــە توێـــژەری بـــاوەڕدار لـــەم حاڵەتـــەدا دەگەڕێتـــەوەو توێژینەوەکەی دووبارەو سێبارە دەکاتەوە و کەمتەرخەمی دەخاتە پاڵ خۆی، یان دەیخاتە پـاڵ ڕێوشـوێنی بـەکارهێنانی بەرنامـە و پڕۆگـرام و لێکۆڵینەوەکـەی، بۆیـە پـەنا ناباتـە بـەر ئـەوەی بڵێـت لەوانەیـە، یـان ڕێکەوتە، یان هیچ یاسایەك نییە بۆ ئەم گەردوونە و دیاردەکانی.

### ٣. دەروازەی تێڕوانین لە ژینگەی بابەتییانەی دەرەکی:

هەموو شتێك بوونێکی زیهنی و بوونێکی دەرەکی (واقعي) هەیە، جا بوونی زیهنی بریتییە لەو وێنە زیهنیانەی کە خەیاڵی مرۆڤ وێنەیان دەکێشن بۆ شتەکان، جا کاتێك دەرمانهێنان بۆ واقیع و ژینگەی دەرەکی، ئەگەر وەك یەك دەردەچوون لەگەڵ ئەوەی لە زیهنماندا وێنەیان کێشراوە، ئەوە ئەو کاتە واقیع و ژینگە دەرەکییەکە پاسادان (تصديق)ی وێنە زیهنیەکە دەکات و پەسەندی دەکات، ئەوکاتە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو وێنە زیهنیە بوونێکی بەرجەستەی دیاری لە دەرەوە هەیە، بەڵام ئەگەر واقیع و ژینگە دەرەکییەکە پاسادانی وێنە زهنیەکەی نەکرد و پەسەندی نەکرد، ئەوە مانای ئەوەیە وێنە زیهنیەکە تەواو نییە و بە وردی نەکێشراوە، یان تەنها خەیاڵێکی زیهنی ڕووتە و هیچ بنەمایەکی لە واقیعدا نییە، خوای گەورە دەفەرموێت: **{قُلْ سِيرُوا فِي الأَرْضِ فَانْظُرُوا كَيْفَ بَدَأَ الْخَلْقَ ثُمَّ اللَّهُ يُنْشِئُ النَّشْأَةَ الْآخِرَةَ إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ}**. (العنكبوت: ٢٠)

مانای: ئەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) پێیان بڵێ: با بگەڕێن بە زەویدا، تەماشا بکەن و سەرنج بدەن چۆن ئەو زاتە دروستکراوانی بەدیهێناوە، لەوەودواش هەر خوا سەرلەنوێ بەرپایان دەکاتەوە، بەڕاستی خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

هەروەها دەفەرموویت: **{أَولَمْ يَنْظُرُوا فِي مَلَكُوتِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا خَلَقَ اللَّهُ مِنْ شَيْءٍ وَأَنْ عَسَى أَنْ يَكُونَ قَدِ اقْتَرَبَ أَجَلُهُمْ فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَهُ يُؤْمِنُونَ}**. (الأعراف: ١٨٥)

مانای: ئایا بۆ سەرنجیان نەداوە لەو هەموو دەسەڵاتە گەورەیەی خوا لە ئاسمانەکان و زەویدا و ئەو هەموو شتانەی کە خوا بەدیهێناون؟ خۆ بەڕاستی ئەجەلیان نزیکبووەتەوە، جا بە چ گوفتارێکی دیکە لە دوای قورئان باوەڕ دەهێنن؟!.

کەواتە بابەتی کۆکردنەوە لە نێوان هەردوو خوێندنەوەکە بابەتێکی مەنهەجییە لە مەیدانی مەعریفەدا و بەرەو ئەنجامێکی ژیارییمان دەبات، چونکە ئەو کەسەی هەردوو خوێندنەوەکە کۆدەکاتەوە، هەرگیز بێنیاز نابێت لە خودای گەورە، چونکە هەست بەوەدەکات کە هەمیشە پێویستی بەخودای پەروەدگار هەیە، بۆیە زۆرداری ناکات و بە دوای خۆبەزلزانی و زاڵبوون بەسەر زەویدا ناگەڕێت و نایەوێت تێکدان و خراپەکاری لە زەویدا بەرپا ببێت و بێباوەڕی بەرپا ناکات و ژیان و ژینگە و ئاوەدانییەکان وێران ناکات و خراپەکاری لە زەویدا بڵاو ناکاتەوە.

## چۆنیەتی کۆکردنەوە لە نێوان هەردوو خوێندنەوەکە

دەروازەی سەرەکی کۆکردنەوەی هەردوو خوێندنەوەکە بە دۆزینەوەی پەیوەندی مەنهەجیی لە نێوان داڕێژەر و ڕێکخەری مەنهەجیی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز دەستپێدەکات کە لە ڕووی بینا و ئیعجازی داڕشتنەوە، یەکپارچەیی بە قورئان بەخشیوە و پەیوەندی مەنهەجیی لە نێوان یاساو ڕێسا بڵاوکراوەکان لەبوون و بوونەوەردا بە شێوەیەك دروستکردووە کە باڵی کێشاوە بەسەر جوڵانەوەکانیدا بۆ دۆزینەوەی ڕێکخەری مەنهەجیی کە بەیەکەوەیان گرێ دەدات، چونکە قورئان سرووشێکی خواییە، بەهۆیەوە دەتوانین لەم گەردوون و بوونەوەرە تێبگەین، لەو ڕووەوە کە قورئانی پیرۆز ڕەها و گشتگیر و هەمەلایەنە، بە ئەندازەی فراوانبوونی تێگەیشتنیشمان بۆ هەردووکیان پێکەوە، بەو ئەندازەیە توانای کۆکردنەوەی نێوان هەردوو خوێندنەوەکەمان لەلادروست دەبێت و ئەو تێکەڵاویە مەنهەجیەی لە نێوان مەنهەجی سرووش (وحي)و گەردوون هەیە، دەدۆزینەوە.

مەنهەجیەتی قورئانی پیرۆز بەرانبەرە لەگەڵ مەنهەجی بوون (وجود)، نابێت تەنها بەشێوەیەکی تیۆری ئەم قسەیە بکەین، یان لەنێو بابەتی (گەورەیی قورئانی پیرۆز) باسی بکەین، بەڵکو پێویستە ئەم ڕاستیانە بە شێوەیەکی پراکتیکی بدۆزینەوە، چونکە قسەی تیۆری (نظري) جاری وا هەیە لە حاڵەتێکی مژدەبەخش بە گریمانەیەك دەرناچێت کە لەوانەیە ڕاستیش نەبێت، یان دەتوانرێت ڕەخنەی

لێبگیرێت، بۆیە کاری سەرەکی موسوڵمانی ئەم سەردەمە پێویستە بریتی بێت لە دۆزینەوە و دەرخستنی ئەو تێکەڵکێشیە مەنهەجیانەی کە لە کۆکردنەوەی هەردوو خوێندنەوەکەدا بوونیان هەیە، مەبەستمان ئەو تێکەڵکێشە مەنهەجیانەیە کە لە نێوان سرووش (وحي) و زانستە مرۆیی و سرووشتیەکاندا هەیە و لەسەر ئەو یاسایانە ڕاوەستاوە کە خوای پەروەردگار بۆ گەردوون و ژیان و مرۆڤ دایناون.

سەبارەت بە قسەکردن لەبارەی گەورەیی قورئان و فەزڵەکەی، لەڕاستیدا قورئانی پیرۆز دەستەوەستانکەرە (مُعجِز)ـە و ئەوەندە فەزڵ و گەورەیی زۆرە کە لە هەژمار نایەت، زانایان بە هەزارەها، بەڵکو بە ملیۆنەها پەڕاویان لەبارەی فەزڵ و گەورەیی و ئیعجازەکانیەوە نووسیوە، بەڵام ئەم هەموو نووسینانە نەیانتوانیوە پەردە لەسەر مەنهەجیەتیەکەی لابدەن، کە هەموو گەردوون و جوڵانەوەکەی لەخۆگرتووە، بەڵکو لەوەش تێپەریوە بۆ چەندەها زانیاری و بابەتی دیکە و توانیویەتی لەسەر بنەما و یاساکانی ڕێنمایی و ئایینی ڕاستەقینە، ڕابووەستێت.

هەروەها ئەو هەموو نووسینانە نەیانگەیاندووینیەتە ئەوەی ئەو تێکەڵکێشیە مەنهەجیانە بدۆزینەوە کە هەیە لە نێوان خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز بە بینا یەکپارچەییەکەیەوە و لە نێوان خوێندنەوەی گەردوون کە لەسەر یاسا و سووننەتە نەگۆڕەکانیدا ڕاوەستاوە. ئەوەتا چەندین ئایەتی پیرۆز و چەندین وتە و دەقی ئایینی کەوتوونەتە بەردەم

تەئویلاتی جۆراوجۆر، لە زۆرێك لەو تەئویلاتانەشدا بابەتە ئیسرائیلیە نارێکەکان و هاوشێوەکانیان [1] بە ڕوونی بەدیدەکرێن.

---

([1]) ئیسرائیلیات لەگەڵ گەلێك بابەت تێکەڵاو کراوە، لە دیارترینی ئەو بابەتانە، تەفسیری قورئانی پیرۆزە، هەوڵی زۆریش دراوە بۆ جیاکردنەوەی ئەو (ئیسرائیلیات)ـانە لە کەلەپووری تەفسیریمان و تائێستاش ئەو هەوڵانە هەر بەردەوامن، لەم بابەتەدا هەندێك لە زانایان کتێبیان نووسیوە، لەوانە: شێخ محمد حسين الذهبي، أبو شهبە، رمزی نعناعة.. و هەندێکی دیکەش، هەروەها لێکۆڵینەوەی زانکۆییش لەم بابەتەدا ئامادەکراوە، لە (ئیسرائیلیات)ـی تەفسیری تەبەری و غەیری ئەو، بەڵام تائێستا هەوڵەکان سەرکەوتوو نەبوون بۆ دانانی چەند هێڵێکی جیاکەرەوە لە نێوان ئیسرائیلیات و غەیری ئیسرائیلیات لە نێو کەلەپوور، چونکە لە سەرەتاکانی ناردنی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) ئەم بابەتانە بەشێکی گرنگیان لە ڕۆشنبیری زارەکی لە دوورگەی عەرەبی پێکدەهێنا، لەبەر ئەوەی زۆرێك لە زاناکانی بەنی ئیسرائیل موسوڵمان بوون و ئەو ڕۆشنبیرییەی پێیان بوو لەگەڵ خۆیان هێنایان و لە ڕێگەی ئەوانەوە گوازرایەوە نێو زانستە ئیسلامییەکان و لە سەردەمی نووسینەوەی کەلەپووریش وەك بەشێك لەو زانستانە نووسرانەوە و تێکەڵاویان بوون.

ئیبن خەلدون لە پێشەکی کتێبە مێژووییەکەیدا هۆکار و شیکارییەکی باشی بۆ ئەم تێکەڵبوونە باسکردووە، لێرەدا پێمان باشە نەقڵی بکەین، ئیبن خەلدون دەڵێت: عەرەبەکان خاوەنی کتێب و زانست نەبوون، بەڵکو خێڵەکیەتی و نەخوێندەواری بەسەریاندا زاڵبوو، بۆیە ئەگەر ویستبایان زانیارییان دەستبکەوێت، سەبارەت بە هۆکارەکانی بوونەوەران، یان سەرەتای دروستبوونی دروستکراوان و نهێنییەکانی بوون، ئەوە پرسیاریان لە خاوەن کتێبەکانی پێش خۆیان دەکرد و سوودیان لەوان وەردەگرت، کە ئەوانیش بریتی بوون لە خاوەنی تەورات لە جولەکەکان و ئەوانەشی شوێنی جولەکە کەوتبوون لە گاورەکان.

ئەهلی تەوراتیش کە لەنێو عەرەبەکان دەژیان، وەك عەرەبەکان، خێڵەکیەتی زاڵ بوو بەسەریاندا و هیچیان لەو بابەتانە نەدەزانی، جگە لەو شتانە نەبێت کە لە نێو کۆمەڵگەیەکەی خۆیان باو و بڵاو بوو، زۆربەیشیان لەوانە بوون کە چووبوونە سەر ئایینی جولەکەکان لە خیڵی

(حمیر)، جا کاتێك کە موسڵمان بوون، ئەو بابەت و زانیارییانەی کە لایان هەبوو، لایان مایەوە ـ لەو شتانەی کە پەیوەندی بە حوکمە شەرعییەکانەوە نەبوو، چونکە خۆیانیان لەو لایەنە دەپاراست ـ، وەك بابەتەکانی سەرەتای دروستبوون و ڕووداوەکان و شەڕ و شۆڕەکان و... هتد. لەوانە (کعب الأحبار، وهب بن منبە، عبدالله بن سلام و هاوشێوەکانیان)، بۆیە تەفسیرەکان پڕ بوون لەو شتانەی لەوانەوە نەقڵکراون، ڕاڤەکەرانی قورئانیش لەوبارەیەوە کەمتەرخەمییان کرد. لە بنەڕەتدا ئەم بابەتانەش وەك وتمان لە ئەهلی تەوراتەوە نەقڵکرا، ئەوانەی لە دەشت و دەر دادەنیشتن و وردەکارییشیان نەبوو بۆ ئەو بابەتانەی نەقڵیان دەکرد، بەڵام لەبەر ئەوەی ناو و ناوبانگیان ڕۆشتبوو و ڕێزیان زۆر بوو و لەبەر پلە و پایەی ئایینی و کۆمەڵایەتییان لەو ڕۆژەدا لێیان وەردەگیرا.

هەروا ماموستا محەممەد عیزە دروزە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) چەندین ڕیوایەتی لە جۆرەها سەرچاوەی عەرەبی کۆن لەم بوارەدا کورتکردووەتەوە کە ڕیوایەتی کەسانی دیکە پاڵپشتیی لێدەکەن و دووپاتی دەکەنەوە و دەیسەلمێنن کە کۆمەڵێك لە نەتەوەی ئیسرائیل لە هەندێك لە ئاوەدانییەکانی دەشتی حیجاز لە سەردەمەکانی دێرین، بڵاوبوونەتەوە، زۆربەشیان لە یەسریب و دەوروبەرەکانی لەسەر ڕێگای شام گیرساونەتەوە، هەندێك لە کەسایەتییەکانیان سەردانی شاری مەککەیان کردووە، یان هەر جێنشین بوون تیایدا و زمانی عەرەبی فێر بووبوون و لەگەڵ ژیانی عەرەبەکان و دابونەریتەکەیان خۆیان گونجاند بوو، تا وایلێهاتبوو هاوپەیمان و یارمەتیدەر و دۆست و بنکەی هێزیان لەوێ بۆ خۆیان پێکهێنابوو و لەلایەن خۆیانەوە زانستێکی زۆریان لەبارەی ئایین و شەریعەتەکان و هەواڵی گەلان و یاسا گەردوونییەکان و ئەو ئایینە ئاسمانیەی کە پابەندبوون پێوەی و ئەو کتێبەی بەردەستیان کە خستبویانە پاڵ خواو پێغەمبەرەکانی، بڵاوکردبووەوە، بەمانە شانازییان بەسەر عەرەبەکاندا دەکرد و بانگەشەی سەرکەوتنیان بەسەریاندا لێدەدا و لە هەموو ئەم شتانەشدا درۆیان دەکرد و فێڵیان لێدەکردن و خۆبەزلزانی و کەشخەیی زۆریان بەسەریاندا لێدەدا، بەهۆی ئەوەی ئەوان خاوەنی زانست و زانیارین و لە لایەن ئەوانەوە زانست و زانیاری لەو دوورگەیەدا بڵاودەبێتەوە، ئەگەرچی زۆربەشی فێڵ و درۆ بوو و هەڵیانبەستبوو.

پێیانوابوو ئەوان دۆست و خۆشەویستی خودان و خاوەن مەقام و پلەی تایبەتن لەلای خودا، ئەمەش کاریگەرییەکی کەمی لەسەر عەرەبەکان دانەنابوو، بۆیە بەو هۆیەوە وای لێهاتبوو جولەکەکان پلە و پایەی تایبەتیان وەرگرتبوو، قازی و کاربەدەست و ڕێنیشاندەر لە ئەوان بوو، بەو هۆیەوە قەوارەیەکی تایفی ئایینیان بۆ خۆیان دروستکردبوو، پەرستگا و مالم و حاخام و قوتابخانەیان لەنێو خۆیان هەبوو، ئەمانە کاریگەری زۆریان لەسەر شوێنکەوتەکانیان هەبوو، هەشیانبوو پلەوپایەیەکەی خۆی بەکاردەهێنا بۆ پارەپەیداکردن بە بەتاڵ، هەروەها سحر و جادوویشیان بۆ ئەو مەبستە بەکاردەهێنا، ئەو جولەکانە لە چەندەها بنەماڵە و هۆز پێکهاتبوون، زۆربەیان لە چەند ناوچە و ئاوەدانی تایبەت بە خۆیان نیشتەجێبوون لە یەسریب (مدینة)و ئاوەدانییەکانی خۆیان بە چەندین قەلا و شوورا قایم کردبوو، هەیانبوو لە باخچە و ئاواییەکانی دەرەوەی مەدینە نیشتەجێ بووبوو، جا هەندێکیان نزیکبوون لە مەدینە و هەندێکیشیان دوور بوون، ئەوێشیان بە چەندین قەلا و شوورا قایمکردبوو، جۆرەها چەکی جەنگی وەك تیر و کەوان و قەڵغان و مەتاڵیان بۆ کاتی پێویست، تێدا هەڵگرتبوو.

لە قەوارەیەکی سیاسی و جەنگی و ئایینی و یەکگرتوودا کۆنەبووبوونەوە، بەڵکو پارچە پارچە و کۆمەڵ کۆمەڵ بوون، جیاوازی و دوژمنایەتییان لەنێویەکدیدا زۆر بوو.

لە مەدینەدا دوو قەبیلەی عەرەبی دەژیان کە قەبیلەی (ئەوس) و (خەزرەج) بوون و شەڕ و دوژمنایەتی بەردەوامیان لەگەڵ یەکدیدا هەبوو، هەندێکیان ـ جوولەکەکان ـ لەگەڵ (ئەوس) و هەندێکیان لەگەڵ (خەزرەج) هاوپەیمان بوون و هەریەکەیان لەگەڵ لایەکەی دیکە دەجەنگا لە کاتی شەڕ و ئاژاوەکاندا هاوکار یەکدیان دەکرد، لەگەڵ هەموو ئەمانە سرووشتی زەلیلی و هەژاری و نەداری و بێدەسەڵاتی و ترس و دەربەدەری و ئاوارەیی و ترسنۆکی بەسەر هەموویاندا زاڵبوو، بۆیە هاوپەیمانیەتییان لەگەڵ عەرەب لەگەڵ ئەو هەموو قەلا و تفاقە جەنگییانە کردبووە هۆکاری سەرەکی بۆ مانەوەیان، لەبەر ئەوە زۆر ڕشت بوون لەسەر مانەوەی شەڕ و کێشە لە نێوان دوو هۆزەکەی مەدینە (ئەوس) و (خەزرەج)، چەندین کێڵگە و کشتوکاڵ و باخچەو ماڵ و موڵکیشیان هەبوو و خەریکی بازرگانی و پیشەسازی و ڕیباکردنیش دەبوون، بۆیە لە ئەنجامی ئەمە زۆربەیان دەوڵەمەند و خاوەن سەروەت و سامان بوون، هەروەها ئەمەشیان یارمەتیدەریان بوو بۆ سەپاندی هەژموونیان بەسەر عەرەبەکاندا. بگەڕێوە بۆ (مقدمة إبن خلدون) (٩٣٥/٣،

بەم شێوەیە وایلێهات لەنێو زانستە مرۆیی و زانستە کۆمەڵایەتییە نوێیەکاندا، بەڵکو لە نێو زانستە سرووشتیە هاوچەرخەکانیشدا، چەندین ڕەهەندی نادیار مایەوە و زۆر پرسیاری سەیر و سەمەرە دروستبوو کە وەڵامی ساڕێژ و دڵنیاکەری لە قوتابخانەی ئەو زانستە جۆراوجۆرانەدا بۆ نەدۆزرایەوە، لەبەر ئەوەی ئەو زانستانە ئەو پەیوەندی و تێکەڵاوییە مەنهەجییەی کە لە نێوان هەردوو خوێندنەوەکەدا (سرووش و گەردوون) هەبوو، نەیاندۆزیەوە و تەنها لە بازنەیەکی کەم و بچووکدا نەبێت بەکاریاننەهێنا کە خۆی بینیەوە لە چەند هەوڵێکی بژاردە و ناوبەناو کە بە هەندێکیانەوە شێواندن و تێکەڵکردن دیاربوو، تا ڕاددەیەکی زۆر دەتوانین بڵێین دروستکراو و هەڵبەستراو بوون، وەك هەندێك لەو هەوڵانەی کە بەم دواییانە بە (الإعجاز العلمي)[1] ناسرا.

---

٩٣٦)، هەروەها (القرأن والمبشرون)، کتێبی خۆشمان (إشكالية الردة) (٣٤ـ٣٦) ط. دار الشروق الدولية بالقاهرة.

([1]) ئیعجازی زانستی (الإعجاز العلمي) ـ ئەوەی ئێمە بیزانین ـ کە یەکەم کەس باسی ئەم بابەتەی کرد، پێشەوا فەخرەدینی ڕازی بوو لە تەفسیرەکەیدا (مفاتح الغيب)، یان (التفسير الكبير)، بەڵام بەو دواییانە بڵاوبووەوە لەنێو زانایاندا و چەندین دامەزراوە بۆ خزمەتکردنی ئەم لایەنە دامەزران و چەندین نووسەر لەم بارەیەوە نووسینیان بڵاوکردەوە.

لەگەڵ ئەوەی دان بەوەدا دەنێین کە سوودی هەبووە بۆ بەهێزکردنی بیروباوەڕی هەندێك لەو کەسانەی ڕۆشنبیری سەردەم زاڵ بووە بەسەریاندا و ئارامی و دڵنیایان بۆ هاتووە کاتێك ڕۆشنبیری سەردەمیان دابەزاندووەتە سەر قورئانی پیرۆز و پێگەی قورئانی پیرۆزیان پێ بەهێز کردووە و وەك دەرچەیەك بەکاریانهێناوە بۆ دەربازبوونیان لەو دوودڵی و سەرلێشێوان و

بۆیه دووپاتکردنەوەی بەردەوامامان لەسەر پێویستی (کۆکردنـەوەی هـەردوو خوێندنەوەکـە)، و دانـانی ئـەوە بـە مـەرجێکی پێـشوەختە و پێویست بۆ دەرچوون لەو گرفتە فیکری و مەعریفییانەی لەسەر ئاسـتی جیهانی و ناوچەیی مرۆڤایەتی تێی کەوتووە، دووپاتکردنەوەمان لەخۆی دەگرێت لەسەر پێویستیی ئاوڕدانەوە لەو پەیوەندییەی لە نێوان قورئان و گـەردوون و مـرۆڤ هەیـە، چـونکە قورئـانی پـیرۆز بنـەماکانی ئـەو

---

گومانانەی لە نێوان رۆشنبیری سـەردەم و قورئـانی پـیرۆزدا بۆیـان دروسـت بـووە، بـەڵام ئێمـە پێمانوایە قورئانی پیرۆز زۆر لەوە بەرزترە کە لە چـواردەوری ڕۆشـنبیری گومانـاوی سـەردەم و زانستە دوودڵەکەی لە نێوان دڵنیایی و ڕێژەیی ئەگـەریی (إحتمـال)ی بـسووڕێتەوە، لـە ڕاسـتیدا ئـەوەی پێـی دەڵـێن ئیعجـازی زانـستی، ئەوپـەڕی ئـەوەی کـە پێـشکەشی دەکـات بریتیـە لـە یەکـسانکردنی قورئـانی پـیرۆز بـە ڕۆشـنبیری سـەردەم و هەوڵـدەدات پـشتگیری سـەردەم و دەستخۆشی ئەو بۆ قورئان بەدەستبهێنێت ، ئەمەش زۆرتر خزمەتـە بـە ڕۆشـنبیری سـەردەم و ڕەواج دانە پێی لە نێـو موسـوڵمانانـدا، نـەك خزمـەت بێـت بـە خـودی قورئـانی پـیرۆز، ئەمـەش پێچەوانەیە لەگەڵ (ڕەهایی قورئانی پیرۆز) و سەپاندنی دوودڵی و گومان و بابەتـە ڕێژەییـەکانی ڕۆشنبیری سەردەمە بەسەر قورئانی پیرۆزدا، جا ئەگەر زانـست لـە یـەك سـەدەدا، یـان کـەمێك زیاتر لە سەدەیەك گۆڕانکاری بەسەردا هات و لە دڵنیایی (یقین)ـەوە گـۆڕا بـۆ گومـان (الـشك) و ئەگەر (إحتمال) و بابەتەکانی لە ڕێـژەیی (نـسبی) و لـە هۆکـاریی (الـسببیة) پتـەو و نـەگۆڕەوە گۆڕان بۆ هۆکاری نەرم وگۆڕاو، ئەوکاتە دەبێت سیفەتەکانی قورئانی پـیرۆز چـیان بەسـەر بێـت گەر ئەم چەشنە ڕۆشنبیرییەی سـەردەممان بەسـەردا سـەپاند؟! بـەڵام (کۆکردنـەوەی هـەردوو خوێندنەوەکە) و (پرۆگرامسازی قورئـان لـە ڕووی مەعریفییـەوە) بـە تـەواوی بەپێـچەوانەوەیە و قورئانی پیرۆز دەکاتە داوەر و بڕیاردەر لەسەر ڕۆشـنبیری سـەردەم و زانـست و مەنهەجـەکانی، کامەی گونجاو و باش بێت دەیچەسپێنێت، کامەیشی گونجاو و بـاش نـەبێت ڕەددی دەکاتـەوە. (خوداش زاناترە)

(سرووشــه خــودایی)ــــەی لــەخۆگرتووە کــە پێغەمبــەران بــە گــشتی هێناویانــە. گــەردوونیش مەیــدانی وشــەکانی خــوای گــەورە و دیــاردەی ویــست ئارەزوەکەیــەتی و مــرۆڤیش جێنــشین کــراوە بــۆ ئــەوەی بــە ڕێنماییەکانی سرووش گەردوون ئـاوەدان بکاتــەوە، بەمــەش بازنــەکانی بیرکردنــەوەی مرۆڤایــەتی کامــڵ و تــەواو دەبــن و هــەموو ڕاگرەکــانی دیکەشی دەردەکەون  و پەیوەنـدی پــەنهانی بـە سرووشـت و مرۆڤـەوە ڕوون دەبێتــەوە و مــرۆڤ لــە گــرفتی جیابوونــەوەی نێــوان ئایینگــەرای ناسوت و کەشیشەیی (لاهوت و ناسوت و ملکوت) ڕزگاری دەبێـت، یـان لە نێـوان دنیـا و دواڕۆژ، یـان لـە نێـوان نێردراوەکـانی خـوای گـەورە و فەلسەفە دانراوەکانی مرۆڤ و ئەوەی ئەو جودابوونەوەیە هێناویـەتی لـە گرفت و بەڵا و ناخۆشی، بەدوای خۆیدا دەیهێنێت.

لەڕاستیشدا تەنها کەسانێك دەتـوانن بـەم کـارە گرنگـە هەسـتن کـە شارەزاییەکی باشیان لە قورئاندا هەبێت و پشکێکی وایشیان لە زانـست و زانیارییەکان پێدرابێت کە بتوانن ئەو تێکهەڵکێشیە مەنهەجییەی هەیە لە نێوان قورئان و گەردوون و مرۆڤدا، بدۆزنەوە.

**بۆیە بنەماکانی (مەنهەجی قورئانیی) لەسەر ئەم پایانەی خوارەوە دامەزرێنراوە:**

### ١ـ دووباره بنیادنانەوەی تێڕوانینی ئیسلامیی مەعریفییانە.

کە لەسەر پایەکانی عەقیدە بەو شێوەیەی دیارییکراون لە قورئانی پیرۆزدا ڕاوەستاوە، هەروەها لەسەر ئەو فاکتەر و تایبەتمەندییانەی دید و بۆچوونە ئیسلامییە دروستەکان هەیانە ڕاوەستاوە، ئەوانیش هەر لە عەقیدەی ئیسلامییەوە سەرچاوە دەگرن، بۆ ئەوەی کە دەگونجێت پێی بووترێت (یاسای مەعریفیی ئیسلامی) ڕوون ببێتەوە کە توانای وەڵامدانەوەی "پرسیارە گشتییە کۆتاییەکانی" هەیە و توانای هەیە بەسەر چارەسەرکردنی ئەوەی کە فەیلەسوفەکانی پێشوو ناویان لێنابوو بە (العقیدة الکبری) مانای: عەقیدەی گەورە بەبێ پەڕاندنی هیچ بەشێکی.

هەروەها ڕاوەستاوە لەسەر دروستکردنی توانایەکی خودیی (ذاتـي) لەسەر ڕەخنەگرتنی مەعیفییانە کە بە شێوەیەکی مەنهەجیی ڕێکوپێك توانای وەرگرتن و تێپەڕبوونمان پێدەبەخشێت، لەهەمانکاتدا توانای بەدیهێنانی مەنهەجیی و مەعریفییانەمان پێدەبەخشێت، بەمەش داهێنان و ڕاڤەی مەعریفییانە دێتەدی، بەشێوەیەك کە لەسەر بنەمای قەناعەتپێکردن و وتاربێژیی ڕانەوەستابێت، بەڵکو لەسەر مەعریفەیەکی مەنهەجییانەی تەواو، ڕاوەستابێت.

**٢ـ دووبـاره پشكنين و دانـانەوەی بنـاغەكـانی پرۆگرامە ئیسلامییەكـان لە هەموو بوارە جۆراوجۆرەكانیدا.**

ئەوەش بـەوەی كـە بـەراوردی بكـەین لەگـەڵ "پرۆگرامـی قورئـانی مەعریفیی" و لەژێر ڕۆشنایی و ڕێنمایی ئەودا ڕێكی بخەینـەوە، چـونكە لـە ئـەنجامی خوێندنـەوە تـاكڕەوی و پارچـەییەكان زیـانێكی زۆر بـەو پرۆگرامە گەیشتووە، بە شێوەیەك كە قورئانی كردووەتە پارچە پارچـە و بوون و مرۆڤی لە كۆن و نوێدا بـە جـودا لـە قورئـان خوێندووەتـەوە، لەبەر ئەوەی عەقڵی موسوڵمان بتوانێت ئەو نەخۆشییە فیكرییانەی كـە كاریگەرییەكەی تووشی شەلەل كـردووە بپـەڕێنێت و چارەسـەر بكـات، وەك نەخۆشـی شـڵۆقی پەیوەنـدی نێـوان پـەنهان (الغیـب) و شـتە بەرجەستە و بەرچـاوەكان (المحسوس) و پـەیوەنـدی نێـوان نـەقڵ[1] و عەقڵ و پـەیوەنـدی نێـوان هۆكارەكـان لەگـەڵ بۆنـەكان (المـسببات)... هتد.

**٣ـ ڕێكخستنی پرۆگرامێك بۆ مامەڵەكردنی لەگەڵ قورئانی پیرۆز.**

ئەمەش بە زانینی دەروازەكانی خوێندنەوە لە ڕێگەی ئەو تێڕوانینە مەنهەجییە شیكارییەوە دەبێت كە قورئانی پیرۆز دەكاتـە سەرچـاوەی بنەڕەتی و دروستكەر بۆ مەنهـەج و عەقیـدە و شـەریعەت و مەعریفـە و

---

([1]) مەبەست بە نەقڵ هەموو ئەو شتانەیە كە خوای پەروەردگار لە ڕێگەی پێغەمبەرانەوە بۆ مرۆڤی ناردووە. (وەرگێر)

دەیکاتە نەخشەکێشی بنەماکانی ئـەو دیـد و زانـستە قورئانییانـەی کـە پێویستە دووبارە بـۆ ئـەم مەبەسـتە دروسـتبکرێنەوە و ڕێکبخرێنـەوە، دەخوازێت هەندێك لەو کە لەپوورە بەمیراتگیراوەی لەم بـوارەدا بۆمـان بەجێماوە بەجێیبهێڵین، کە خۆی دەبینێتەوە لە هەندێك لەو زانستانەی لە ڕابردوودا ڕۆڵی خۆیان لە خزمەتکردنی دەقـی قورئـانی و زانایـان لـە قۆناغی دروستبوونە مێژووییەکەیدا سوودیان لێبینین، بەڵام ئێـستا وردە وردە پێویـستی بـۆ زیـادکردن لەسـەریان دەردەکـەوێت، بـە مەبەسـتی بەدەمەوەچـوونی پێویـستییەکانی ئوممـەت لـە ئێـستا و داهاتوویـدا، چـونکە مرۆڤـی بەڕەگـەز عـەرەبی - لـە چوارچـێوەی تایبەتمەندییـە پێکهاتەییەکانی (تكويني) یەکەمجاریدا - لە ڕووی عـەقڵی و دەروونـی و زمانەوانیـەوە لـە قورئـانی پـیرۆز تێگەیـشتووە، ئـەو تایبەتمەندییـە پێکهاتەییانــە لــە ســەرەتاوە زۆر ســادە و ســنوورداربون لــە ڕووی کۆمەڵایـەتی و هزریـەوە، زۆرتـر لـە چوارچـێوەی زمانـەوانی و هەنـدێك دەرەنجامی نەقڵی و زارەکییدا خۆی دەبینیەوە، کە وای کردبوو زۆرتـر بایەخ و گرنگی بە نـەقڵکردنی دروسـت و تونـدوتۆڵکردنی گێردراوەکـان (رِواية) بدرێت، بەو ڕێگەیانەی کە لەو کاتەدا ناسراوبوون.

ئەم تەرزەش نموونەی بەرزترینی زانستەکان بوو لەو سەردەمەدا، تا کاتێـك نووسـینەوەی فـەرمیی ئـەو زانـستە ئیـسلامییە نەقڵیانـەی لـە چواردەوری دەقەکانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر (دروودی خوا لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی بێت) دەسووڕێنەوە، لە سـەدەی دووهـەمی

کۆچیدا دەستی پێکرد و ئەوکاتە ئەو تایبەتمەندییانە دەرکەوتن کە لەو زانستە مەعریفییانەدا هەبوون، هەروەها شانبەشانی ئەو تایبەتمەندییە عەقڵییە ڕەوانبێژی و زمانەوانییانەی زمانی عەرەبی لەو قۆناغەدا دەردەکەوتن، لەگەڵ ئەوەی داخوازی دەکرد لە ڕۆیشتن بەرەو ڕووی دابەشکردنی لێکۆڵینەوە لە ڕستە و شیکردنەوەکان، لەگەڵ تێبینیکردنی یەکە یەکەی وشەکان هەر لەسەرەتاوە، کەواتە سەیر نییە پێناسەکردنی زانستی ڕاڤەکردن (التفسیر) کە یەکێکە لە گرنگترینی زانستەکانی تێگەیشتن لە قورئانی پیرۆز، بەوەی کە بریتییە لە: زانینی شێوەی وشەکانی قورئانی پیرۆز، ئەمە ئەو پرۆگرامە کارپێکراوە بوو لەو کاتەدا، بۆیە ئەو تێگەیشتنەی کە لێی پەیدابوو، قبوڵکراو بوو، بۆ قۆناغی ئەو کاتە و ئەو قۆناغانەی بەدوایدا هاتن، بەسبوو، بەڵام لەم قۆناغەی ئێستای مرۆڤایەتییدا کە (لۆژیکی تێگەیشتنی مەنهەجی مرۆڤایەتی) زاڵە بەسەر شتەکاندا و گەڕان بە دوای ئەو پەیوەندییانەی کە ڕێکیان دەخەن بەشێوەیەکی شیکاری و ڕەخنە ئامێز و ئەو چوارچێوە زانستییە جیاوازانەی کە بەکاریاندەهێنن و گرێیان دەدەن لەگەڵ بابەتە شارستانیە ئاڵۆزەکان و پەیوەندییە جۆراوجۆرەکان، پێویستە دووبارە چاو بخشێنرێتەوە بەچۆنیەتی گەشەپێدان و نوێکردنەوەی ئامرازی دەقەکان و خزمەتکردنیان و خوێندنەوەیان بەشێوەیەك کە کۆیان بکەینەوە لەگەڵ گەردوون و زانینی ڕەهەندەکانی ئەو تێکەڵاویە مەنهەجییانەی کە لە نێوان قورئان و گەردوون هەیە،

پاكژكردنەوەی زۆرێك لە لایەنەكانی تەفسیر و ماناكردنی قورئانی پیرۆز و ئـەو كەلـەپوورەی پەیوەنـدی بـەو قۆناغانـەوە هەیـە، بـۆ لابردنـی پاشماوەكانی كاریگـەری بـوون بـەو پەیوەندییـە تونـدو تۆڵـەی كـە بـە شێوەیەكی ڕێژەیی هەبوو بە بابەتە خراپە ئیسرائیلیەكان و بابەتەكانی دیكـەوە و گرێـدانی تـەواو بـە بۆنـە و هۆكارەكـانی هاتنـەخوارەوەی ئایەتەكان.

بۆ ئەوەیش كە ڕووەكانی بەرەنگاربوونەوە بە قورئانی پیرۆز و لایەنە ئیعجازییە كاریگەرەكانی لەم سەردەمەدا دەربكەون، پێویستە ـ ئێستا ـ ڕەهەنـدە كۆمەڵایـەتی و مەنهەجییەكانیـشی بخرێتـە پـاڵ، بـۆ ئـەوەی بەهۆیـــەوە بەرەنگاربوونـــەوەی بـــەردەوام بێتـــەدی و ئیعجازەكـــەی دەربكـەوێت كـە دەبێتـە بەڵگـەی مەنهـەجیی یەكـەم لەسـەر ڕەهـایی و ڕێژەیی نەبوونی و بە شێوەیەكی ئاسایی لە (ئیعجـازی زانـستی) تێپـەڕ دەبین، لەبەر ئەوەی كە تەنها بریتییە لە سەپاندنی رۆشنبیری سەردەم بەسەر قورئاندا، ئەمەش مەبەستی ئێمە نییە.

### ٤ـ دروستكردنی پرۆگرامی مامەڵەكردن لەگەڵ سوونەتی پاك و بێگەردی پێغەمبەر (دروودی خوا لەسەر بێت).

هەروەها لە ڕێگەی ئەو تێڕوانینە پرۆگرامیە و بەگوێرەی ئەوەی كە سوونەتی پێغەمبەر (دروودی خـوا لەسـەر خـۆی و بنەماڵەكـەی بێـت) سـەر چـاوەیەكی ڕوونكەرەوەیـە بـۆ قورئـانی پـیرۆز و ئـەوەی قورئـان هێناویەتی زۆربەی لە ڕێگەی ئـەوەوە جێبـەجێ دەكرێـت، لەبـەر ئـەوە

ســـوونەت درێـــژەی هـــەموو بابەتـــەکانی مەنهـــەج و شـــەریعەت و جێبـــەجێکردن و یاســـاکانی مەعریفـــە و کۆڵەکـــە و پێکهاتـــەکانی دیـــدی ئاوەدانی و شارســـتانی لـــەخۆدەگرێت، چـــونکە قۆنـــاغی پێغەمبەرایـــەتی (درودی خوا لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی بێت) و سەردەمی هاوەڵان

قۆناغێـــك بـــوو پـــشتی بـــە پەیوەنـــدی ڕاســـتەوخۆ بـــە پێغەمبـــەرەوە (درودی خوا لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی بێت)و هەروەها شوێنکەوتن و چـــاولێکەری لـــە کـــردار و گوفتارەکانیـــدا بەســـتبوو، وەك دەیفـــەرموو: (لتأخـذوا عـني مناسـككم)[1]. مانـای: شـێوازی پایـە و پێویـستییەکانی حەجکردن لە مـن وەربگـرن و لـە چـۆنیەتی ئەنجامـدانی تەماشـای مـن بکەن.

هەروەها دەیفەرموو: (صلوا كما رأيتموني أصـلي)[2]. مانـای: چـۆن من دەبینن نوێژ دەکەم، ئێوەش ئاوا نوێژەکانتان بکەن.

شـــوێنکەوتن و تەماشـــاکردن پـــشتدەبەستن بـــە تێبینییکردنـــی جوڵانەوەی کرداریی و شێوازی جێبەجێکردنی پێغەمبـەر (درودی خـوا لەسـەر خـۆی و بنەماڵەکـەی بێـت) و وردبوونـەوە لـە ژیـانی ڕۆژانـەی، چونکە پێغەمبەر بە کردار و گوفتارەکانی قورئـانی پـیرۆزی لـە واقیعـدا

---

([1]) بگەڕێوە بۆ صەحیحی مسلم ژمارە: (١٢٩٧)(٢/٩٤٣) بە تەواوی لەوێ دەستتدەکەوێت.

([2]) بگەڕێوە بۆ صەحیحی بوخاری ژمـارە: (٢٢٦) (ص: ٦٠٥) وەبگـەڕێرەوە بـۆ محـصولی ئیمامی رازی (٣/٤٣/٥٢/٢٥٠).

بەرجەستە کردبوو، بۆ ئەوەی پەیوەندی نێوان دەق و ژیان بە ڕوون و ئاشکرایی نیشان بدات، چونکە جێبەجێکردنی کردەیی پێغەمبەر (دروودی خوا لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی بێت) بۆ قورئانی پیرۆز و ڕوونکردنەوەی ئایەتەکانی، ئەو کەلێنانەی نێوان پێکهاتەکانی مەنهەجی خوایی لە قورئاندا و کەلێنەکانی نێوان واقیعی بەپێی ئەندازەی ڕۆشنبیری خەڵکەکە و عەقڵ و توانای فیکری و مەعریفییان و بیرکردنەوەیان لەو سەردەمەدا، بە تەواوی بەرتەسك دەکردەوە، بە مەرجەکانی هەڵکەوتەی واقعی کۆمەڵایەتی و زانستی و زمانەوانی کە لەو کات و ساتەدا باو بوو، بۆیە ڕاویەکانی هاوەڵان (ڕەزای خوایان لێبیت) سووربوون لەسەر ئەوەی هیچ شتێکیان لێنەفەوتێت لەو شتانەی کە پەیوەندی بە ژیانی پیغەمبەرەوە هەیە (دروودی خوا لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی بێت) ئەگەر لاوەکی و بچووکیش بێت، چونکە ئەو تاکە جێگرەوە بوو بۆ تێگەیشتن لەو مەنهەجەی کە بابەتە جیاوازەکانی سەردەمی ئەوانی ڕێکخستبوو و پوختی کردبوو بۆ مەنهەجی جێبەجێکردن (تطبيق) بۆ ئەوانەی کە لە دوای ئەوان دێن، بۆیە دەبینین ڕیوایەتەکانیان ئەو ئەندازە زۆرەیان لەخۆگرتووە لە فەرمایشت و کردار و تەقریراتەکانی پێغەمبەر (دروودی خوا لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی بێت) و تەواوی ئەو بابەتانەیان بۆ گێڕاوینەتەوە کە وا دەکات ئەو وەچانەی بە دوای وەچەی یەکەمدا هاتن، بتوانن پابەند بن پێوەی و شوێنی بکەون و لەوێوە مەنهەجێك لە شوێنکەوتنی قورئانی

پیرۆز پوخت بکەنەوە، کە بریتیە لە شوێنکەوتنی جووڵەی ڕۆژانەی پێغەمبەر (دروودی خوا لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی بێت) لە هاتن و چۆنی و ئاشتی و شەڕی و فێرکردنی و قەزاوەت و بڕیارەکانی و سەرکردایەتییکردنەکەی و فەتواکانی و مامەڵە مرۆڤایەتیەکانی بەشێوەیەکی وا کە شێواز و سوننەتەکانی، یان مەنهەجی مامەڵەکردنی لە واقیعدا ڕوون بکاتەوە، سەرەڕای ئەوەش تایبەتمەندی ئەو واقیعەی پێغەمبەری خوا (دروودی خوا لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی بێت) مامەڵەی لەگەڵ دەکرد و ژیانی تیایدا بەسەردەبرد ـ گومانی تێدا نییە ـ جیاوازە لەگەڵ ئەم واقیعەی ئێمە تێیدا دەژین، لە ڕووی بابەت و پێکهاتە و کێشە و پەیوەندییەکانی خەڵکەکەیەوە بەشێوەیەکی جۆریی (نوعي)، هەروەها لە ڕووی ڕێژەییش کە هەمومان هەست بەو جیاوازییانە دەکەین.

بەڕاستی پێغەمبەری خوا (دروودی خوا لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی بێت) لە ژیان و سوننەتەکانیدا نموونەی لێکدانی مەنهەجی قورئانیی و واقیعی بەرجەستە کردبوو، هەر بۆیە ئەستەمە تێگەیشتن لە زۆرێك لە بابەتەکان بەدوور لە تێگەیشتن لەو واقیعەی کە پێغەمبەر (دروودی خوا لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی بێت) تیایدا دەژیا و جیهاد و هەوڵ و تێکۆشانی تێدا دەکرد بۆ ئەوەی بیگۆڕێت و چاکسازی تێدا بکات، ئەو تێگەیشتنەش بە خوێندنەوەی واقیعی سەردەمی پێغەمبەریی و ئەوەی

تێیدایەتی، هەروەها خوێندنەوەی هۆکاری هـاتنی فـەرموودەکان و ئـەو ڕووداوانەی پێیانەوە گرێدراون، دەبێت.

ئەو فەرموودانەی پێغەمبەر جاری وا هەیە ڕا جیاوازەکان دەیانکەنـە چەند قسەیەکی بەش بەش، بە شێوەیەك وای لێـدێت مانـای دژبەیـەکی لێوەردەگیرێت و وەك قسەی پێشەواکانی مەزهەبە جیاوازەکانی لێدێت، ئەگەر ئەو پەیوەندییە مەنهەجییەی نێوانیان کە باسکرا تێبینی نەکرا.

موسڵمانان لە قۆناغی هاتنەخوارەوەی قورئانی پیرۆز وابەستە بـوو بوون بە ماناکانی خۆچواندن بە پێغەمبەری خـوا (دروودی خـوا لەسـەر خـۆی و بنەماڵەکـەی بێـت) و شـوێنکەوتن و پـەیڕەوکردن و ڕێنمـای وەرگـرتن بـە کـردار و گوفتارەکـانی، بـە هـیچ شـێوەیەك فـەرمانیان پێنەکراوە بە لاساییکردنەوە (التقلیـد)، جـا ئـەو چـوار مانەیـە لـەوەدا یەکدەگرنەوە کە هەموویان کاتێك دەهێنرێنەدی دەخوازن مەنهەجی ئەو کەسە پێیان بزانرێت و بدۆزریتەوە کە شوێنی دەکەویت، کە پێغەمبەرە (دروودی خوا لەسەر خـۆی و بنەماڵەکـەی بێـت)، هـەر لەبـەر ئەوەشـە خوای گەورە فەرمانی کردووە بە پێغەمبەر (دروودی خوا لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی بێت) بـە شـوێنکەوتنی ڕێنمـایی پێغەمبـەرانی پـێش خـۆی خوای گەورە دەفەرموێت: {**أُولَئِكَ الَّذِينَ هَدَى اللَّهُ فَبِهُدَاهُمُ اقْتَدِهْ**} . (الانعام: ٩٠)

ماناى: شوێنى مەنهەجى ئەوان بكەوە لە گوێڕایەڵى و بانگەواز و ڕاگەیاندن و ڕوونكردنەوەى پەیامى خواى گەورە و جێبەجێكردنى، بەڵام فەرمانى پێ نەكرا بە لاساییكردنەوەیان.

ئەمە واى لە هاوەڵانى پێغەمبەر (دروودى خوا لەسەر خۆى و بنەماڵەكەى بێت) كرد كە پێغەمبەر بكەنە پێشەنگ و پێشەوایەكى كردارى كە بە گوێرەى مەرجە واقعییەكانى ژیانیان مەنهەجى لە خۆیدا بۆیان بەرجەستە كردووە. دەكرێت لە هەڵوێستى ئیمامى ئەبوبەكر و ئیمامى عومەر (ڕەزاى خوایان لێبێت) بەرانبەر بە سوننە، هەروەها هەڵوێستى دایكى موسڵمانان و گەورە قورئانزانەكان و هاوەڵە فەقیهەكەن (ڕەزاى خوایان لێبێت) تێبینى ئەوە بكەین.

لە شوێنكەوتن و پەیڕەوكردن و ڕێنمایى وەرگرتن ئاڕاستەكانى مامەڵەكردن لەگەڵ گێڕدراوەو (مأثور)، گوازراوە (منقول)، پەیدابوو، ئەوەى ڕێنمایى پێ وەرگرت ئەوە وەریگرتوو، ئەوەى پێى وەرنەگرت ئەوە لێى لادا، ئەوەیشى خوا تەوفیقى دا و تێگەیشتنى وردى بۆ گێڕدراوەكان (ماثور) كرد و پێكانى پێبەخشى، ئەوەیش كە بەدبەختى و لاڕێیى هەڵبژارد شكستى پێهێنا و لێى لادا.

بۆیە لاى هەندێك لەوانەى لە دواى ئەوان هاتن، پێویستى بۆ ئاسانكارى لەو شوێنەوارانەى كە پەیدا بوون لە ئەنجامى مامەڵەكردنى بەشیى (جزء) لەگەڵ قورئانى پیرۆز و ڕیوایەتەكانى فەرموودە و سوونەتەكان كە بە پارچە پارچەیى و دوور و جودا لە سیاقەكانیان

ڕیوایەت کرابوون، پەیدابوو ـ دوای ئەوە ـ هەندێك پەنایان بردە بەر ماناکردنی ناوەیی (باطني)و ڕاڤەکردنی ئاماژەیی و هێمایی، بە بەڵگەی ئەوەی کە دەرچەیەکە لە پابەندبوون بە پیتبەندی (حرفیت) گێڕدراوەکانەوە، یان پابەندبوون بە لایەنە جوزئیەکانەوە، هەندێکیش ڕەتکردنەوەی فەرمودەکانیان زۆر ئاسان کرد، بەڵام زۆرێك لەو هەوڵی تەئویلانە هیچ سوودێکیان نەبوو، بەڵکو بابەتەکانیان زیاتر ئاڵۆز کرد. پاشان گرفتی بەڵگەیی سووننە (حجية السنة) سەریهەڵدا، بەشێوەیەکی گشتی، یان بەڵگەیی هەندێك لە جۆرەکانی، بێجگە لەوانە لە هەندێك پاشماوەی بابەتی دیکە کە تائێساش بەدەستیانەوە دەناڵێنین، هەندێك بابەتی هزریی دیکەش کە لە دوای خۆیان لێیان بەجێما، خۆ ئەگەر لە سەرەتاوە مەنهەجی قورئانی ڕوونکرابایەوە لەمەڕ چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ فەرمایشت و کردارەکانی پێغەمبەر (دروودی خوا لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی بێت) و ئەو شتانەی ئەو ڕەزامەندی لەبارەیانەوە دەربڕیوە، ئەو کاتە دەگونجا مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو نەقڵکراوانە ـ بەگشتی ـ ڕێکبخرێت و بابەتە جوزئیەکان بگەڕێندرێنەوە بۆ یاسا گشتییەکان و ئەوکاتە لە چوارچێوەی ئەو مەنهەجەدا گشت بابەتە لاوەکییەکان تێدەگەیشتین، چونکە مەنهەج دەستەبەرە (کفیل) بە ڕوونکردنەوەی مەبەستەکان و دەرخستنی ئامانجەکان.

لۆژیکی ئەم سەردەمە لۆژیکێکە ـ بە بەردەوامی ـ لێکۆڵینەوە لەمەڕ ڕێکخەری بابەتییانەی کارەکان دەکات و هەوڵدەدات لە گشت ڕەهەندە

جیاوازەکانەوە بەرەو پرۆگرامسازی تەواو بڕوات، ئەم پرۆگرامسازییە پشت بە شیکاری پرۆگرامی و لێککردنەوەو ڕەخنەگرتن و راڤە دەبەستێت، بەڵێ ئەمانە دەکاتە ئامرازی سەرەکی و چوارچێوەی بابەتیی بۆ جوڵانەوەی هزریی لە کاتی مامەڵەکردن لەگەڵ دەقەکان و بابەتە گەردوونی و خۆجێیییەکان دادەنێت، ئێمەش بەم جۆرە پرۆگرامسازییە دەتوانین دەرباز بین بەرەو گەیشتن بە مەبەستە قورئانییەکان و تەوەر و بەها بەرزەکانی و یاسا گشتییەکانی و جوان لە سوونەتی پێغەمبەر (دروودی خوا لەسەر خۆی و بنەماڵەکەی بێت) تێبگەین، بەشێوەیەکی مەنهەجیی وا کە بمانپارێزێت لە کەوتنە نێو چوارچێوەی ڕابردووی ڕاوەستا، یان ماناکردنە ناوەوەییەکان، یان ئەو هەوڵە تازەگەرییانەی کار دەکەن لەسەر پەیداکردنی هەندێك چاکسازی ماناکردن بۆ هەندێك بابەتی جێبەجێکراوی ڕابردوو، بۆ دووبارە بەکارخستن و بەرهەمهێنانی لە ئێستادا، وەك بڵێی دەربڕینیان لە ڕابردوودا بە پۆشاکێکی تازەوە.

### ٥ـ دووبارە خوێندنەوەی کەلەپووری ئیسلامی.

خوێندنەوەی ئەو کەلەپوورە بە خوێندنەوەیەکی ڕەخنەئامێز و شیکارییانەی مەعریفی و بەراوردکردنی لەگەڵ مەنهەجی بە ڕاستدانان و هەژموونداننانی قورئانی، بۆ ئەوەی دەربچین لەو سێ بازنە باوەی کە بڕیار لەسەر شێوازی مامەڵەکردنمان لەگەڵ کەلەپوورەکەمان لەم

سەردەمەدا، دەدات: بازنـەی ڕەدکردنـەوەی ڕەهـا، بازنـەی وەرگـرتنی ڕەها، بازنەی هەڵبـژێرکردن بـەبێ پرۆگـرام، چـونکە ئـەم سـێ بازنەیـە ڕێگەمان لێدەگرن لـەوەی کـە بـەردەوام بـین لەسـەر ئـەوەی پێویـستە بەردەوام بین لەسەر ئەم کەلەپوورە، هەروەك چۆن یارمەتییمان نادەن بـۆ بــەدیهێنانی دڵنیــابوون و گومــانبڕین و دڵنیــایی لــە هەنــدێك لــەو بابەتانەی کە کەلەپوورەکەمان پێویستی بە دڵنیابوون تیایاندا هەیە.

## ٦ـ دروستکردنی پرۆگرامێك بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ کەلەپووری مرۆڤایەتی لەم سەردەم.

هەروەها ئەوەی کە بە کەلەپووری ڕۆژئـاوایی (الـتراث الغربـي)، یـان هزری ڕۆژئاوایی (الفكر الغربي) ناسراوە، پێویستە مامەڵەی موسوڵمانان لەگەڵیدا لەو شێوازەی ئێستای بگۆڕێت، کە لە چوارچـێوە و هەوڵــە لــە یەکـــــدی نزیککـــــەرەوەکان و بەراوردکارییـــــەکان و پاشـــــان ڕووبەڕووکردنەوەکان و ناڕەزاییەکان پەیدا بووە، بۆ ئەوەی بە ڕوحێکی گــەورەو خــۆ لــێ گێلکردنــەوە بــە ڕەهــایی ڕەدی بکاتــەوە و کۆتــایی پێبهێنێت، یان بـە ڕەهـایی و بـە ڕوحێکـی تـەواو ملکـەچ و بـە ناچـاری وەریبگرێت، یان بە بژێرکردنێکی ڕەشۆکی وا کە، یـان بـە لای قـازانجی ئەودا بشکێتەوە، یان بە زیانی ئەو بشکێتەوە، وەریبگرێت.

جا ئەو شەش هەنگاوانە، یان کارە گرنگانە ئەوانەن کە دەکرێت پێیـان بگوترێت هەنگاوەکان بە ئاراسـتەی دروسـتکردنی (مەنهـەجی یەکخـستنی

مەعریفە)، ئەوەش لەبەر ئەوەی بۆ یەکەم جارە ئیمە خۆمـان لـە بـەردەم دۆخێکی جیهانی وا دەبینینەوە کە کار دەکات بـۆ بـەکارهێنانی زانـست و زانیارییەکان و دۆزینەوە زانـستییەکان و دەسـتکەوتەکانیان، بەشـێوەیەك کە بە فرێدانی هەندێك بیروبۆچـوون لـەبارەی بوونـەوەر کـە هەنـدێکیان وا دەردەکـــەون پێـــچەوانەی بیروبـــاوەڕە ئایینیـــەکان بـــن بـــە گـــشتی و بیروبۆچوونی مەعریفی ئیسلامی ئێمەش بن بەتایبـەتی، پەیوەنـدی نێـوان خودای دروستکەر و گەردوون و مـرۆڤ دەپـچڕێنێت، جـا ئـەم پێـچەوانەییە ڕاست و واقیعی بێـت، یـان نـا، وەڵامدانـەوەیان و دەربـازبوون لێیـان وەك گرفتێکی هزریی، بەوە نابێت هەندێك بابەت لە گوتارە کەلەپوورییەکانمان هەڵبـــژێرین و نزیکـــی بکەینـــەوە لـــە هەنـــدێك شـــت کـــە لەگـــەڵ ئـــەو بیروبۆچـوونانەی ئـەوان یـەك بگرێتـەوە، بـۆ ئـەوەی بڵـێین ئـەوەی ئێـوە دەیڵـێین پێـشتر ئێمـە وتوومانـە و لـە کەلـەپووری ئێمـەدا هەیـە، یـان بـە تـــەواوی ڕەدی بکەینـــەوە و مـــۆری کـــوفری لێبـــدەین، نـــەخێر، هـــەر لـــە بنەڕەتەوە هەڵوێستی ئێمە بەرانبەر زانستە گەردوونییـەکان هەڵوێـستێکی ئایینگەراییانە (لاهوتی)، یان کەشیشیانە (کنهوتی) نییە.

ئێمە داواشمان لێ نەکراوە لاسایی غـەیری خۆمـان بکەینـەوە، چـونکە ئەزموونی ئەوان لەگەڵ زانـست و دەسـتکەوتەکانی جودایـە لـە ئـەزموونی ئێمە، ئەگەر قورئـان ئایینگـەری (لاهـوتی) بوایـە، ئـەوا دروسـت نـەدەبوو بخوێندرێتەوە، تەنها لەیەك لایەن و بە یەك ڕەهەند نەبێت، مانای تەنها بە خوێندنـــەوەی یەکـــەم، بـــەڵام ئێمـــە فـــەرمانمان پێکـــراوە بـــە دوو جـــۆر

خوێندنەوە، خۆ ئێمە هەرگیز ململانێ و دژایەتی زانستمان نەکردووە و ڕەدماننەکردۆتەوە و زاناکانمان نەکوشتووە، لەبەر ئەوەی ئێمە دەزانین ئەو سرووشەی (وحي) کە خۆی لە قورئانی پیرۆزدا دەبینێتەوە، هەمان ئەو سرووشەیە کە خۆی لە گەردوون و سرووشتدا دەبینێتەوە، هەریەکێکیشیان بەشێوازی مەنهەجیی تایبەتی خۆی دەخوێنرێتەوە، جا ئەگەر هەندێك لادان پەیدابوو و خرایشە پاڵ زانستەوە، ئەوە پێویستە لەسەرمان زانستی لێ پاك بکەینەوە، ئەگەر لادان لە ڕاڤە و ماناکردن پەیدابوو، پێویستە پارێزگاری لە دەق بکەین و نە هێڵین کاریگەری لەسەری هەبێت.

ئەمە بناغەی (کۆکردنەوەی هەردوو خوێندنەوەکەیە)، چونکە ـ لە ڕابردوودا ـ ئەوەی ڕووبەڕووی ئایین دەبووەوە، تەنها هزرێکی عەقڵی دانراوی ڕووت بوو، بەڵام پڕچەك نەبوو بە زانستی ڕێکخراوی سەردەم و ئەو دەرەنجامانەی کە بوونە هۆی پەیدابوونی چەند بیروباوەڕ و ڕێبازێك کە لە شێوە باوەکە (التقليد) تێپەڕین، کەواتە ئەوەی پێویستە لەسەر ئێمە ـ وەك فەرمانیشمان پێکراوە ـ ستاندنەوەی زانستە لەو بیروباوەڕ و ڕێبازانە و پتکردنەوەیەتی و دووبارە بەکارهێنانەوەیەتی، هەروەها پێویستە ئەو مەعریفە و زانستانەی کە بۆ خزمەتکردنی دەق بەکارهێنرابوون پاڵفتە بکەین و لەو شتانەی کە پێیانەوە لکێندراوە، یان خراونەتە پاڵی، جودا بکەینەوە، بۆ ئەوەی خوێندنەوەکە ڕێکبخرێت و تواناکانی (کۆکردنەوەی هەردوو خوێندنەوەکە) بێنەدی.

## کارەکە قورئانیە، هەروەها جیهانییشە

ئـەم کـارە ـ کـە خـۆی دەبینێتـەوە لـە ڕوونکردنـەوە و دەرخـستنی پرۆگرامی قورئان لە ڕووی مەعریفییەوە ـ کارێکی جیهانییە و پەیوەندی بە هەموو جیهانەوە هەیە و بۆ هەمووی گرنگە و هەموو جیهان پێویستی پێیــەتی، ئەگەرچــی هەنــدێك وا بــیری لێدەکەنــەوە کــە کارێکــە لــە چوارچێوەی جوگرافیادا و لەنێو موسوڵمانان پێویستە گرنگی پێبدرێت، بەڵام ئێمە ـ لەم سەردەمەماندا ـ بەشێکی کاریگەر بووین لەگەڵ جیهانی ئەمڕۆدا، ئەوەش نەك بەهۆی هەڵمـەت و هێرشـی ڕۆشـنبیری ئـەوان بـۆ سەر موسوڵمانان، چونکە ئەوە شتێکی ئاسایی بوو لە سەدەکانی ١٨ و ١٩ی ڕابردوودا، بەڵکو بەهۆی کاریگەربوونمان لەگەڵ جیهانی ئەمڕۆدا لە ڕێگەی هەڵمەتی زانستی ئـەزموونی (تجـريبي) و پڕاکتیکـی (عملـي) کـە داخوازی ئەوەمان لێدەکات هەوڵ بدەین (پرۆگرامی قورئـانی پـیرۆز لـە ڕووی مەعریفیەوە) بەشێوەیەك ڕوون بکەینەوە کە بەرانبەر بێت لەگەڵ هــەوڵ و مانـدوبوونی ڕابردووانــی بـەڕێزمان لـە بەرەنگاربوونـەوەی ئـەو هەڵمەتــە فیکرییــەی کــە لەگــەڵ هەڵایـسانی شۆڕشــی فەڕەنــسا لــە دەرگاکانمـانی دا، چـونکە ئەوکاتـە بـە هەنـدێك بابـەتی عـەقڵیی ڕووت بــەرەنگارمان دەبوونــەوە و بــە توانـا عەقڵییــە ســنووردارەکانی ئــەو ســــەردەمەی خۆیــان هاتبوونــــە پێــشەوە لێمــان، بــەڵام ئێــستا بەرەنگاربوونەوەکـە لەگـەڵ عـەقڵێکی زانـستیی ئەزموونییـە کـە خـۆی سەلماندووە و سەپاندووە، دووبارە زانستە سرووشتی و هەموو زانستە

مرۆڤایەتییەکانی بە پشت بەستن و گەڕانەوە بۆ تاقیکردنەوە و ئەزموون دارِشتووەتەوە، جا ئێمەی موسوڵمان، یان دەبێت پەنا ببەینە بەر هەڵوێستی بەرگرییکردنی ئایینگەراییانەی (لاهوتی) بێدەسەلات - کەسانێکیش هەن وا دەکەن - یان پەنا ببەینە بەر کارکردن بۆ بڕین و چوونە نێو ئەم شێوەیە لە شارستانی و ڕۆشنبیرییەی سەردەم بە دیدێکی قورئانیی گەردوونی گشتگیر، چونکە ئەو زانستە ئەزموونییانە تائێستاش جاری وا هەیە لە کاتی ڕۆیشتن و پێشڕەویاندا تووشی هەڵەنگوین و کەوتن دەبن، هەموویان وابەستەن بە بابەتە بەشی و لاوەکییەکانەوە و ڕەهەندێکی گەردوونیی گشتگیری وایان لەخۆنەگرتووە کە خودای گەورەی پێ بدۆزنەوەو لە هەڵخلیسکان بیانپارێزێت، چونکە ڕەهەندی گەردوونیی تەواو تەنها لە ڕوحی قورئاندا خۆی دەبینێتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: {**إِنَّ الَّذِينَ يُجَادِلُونَ فِي آيَاتِ اللَّهِ بِغَيْرِ سُلْطَانٍ أَتَاهُمْ إِنْ فِي صُدُورِهِمْ إِلاَّ كِبْرٌ مَا هُمْ بِبَالِغِيهِ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ (٥٦) لَخَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ النَّاسِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لاَ يَعْلَمُونَ**}. (غافر: ٥٦و٥٧) مانای: بەڕاستی ئەوانەی موجادەلە و گفتوگۆی سەرکەشانە دەکەن و بە نەشارەزایی و بێ بەڵگە لە ئایەتەکانی خوا دەدوێن، ئەوانە تەنها خۆ بەزلزانین لە سینەیاندا هەیە و هیچ بەڵگەی ڕاستیان بەدەستەوە نییە، بۆیە هەرگیز ناگەنە ئامانجی خۆیان، کەواتە پەنا بگرە بە خوا لە شەڕی خوانەناسان، چونکە بەڕاستی ئەو زاتە بیسەر و بینایە (٥٦) بەڕاستی

دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی لە دروستکردنی خەڵکی زۆر گەورە و گرنگترە، بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەم ڕاستیانە تێناگەن و نایزانن.

لەگەڵ ئەوەی ئەم کارە کارێکی گرنگی جیهانییە، ئەوەشمان بۆ دووپات دەبێتەوە کە کارێکی قورئانیی تەواویشە، چونکە لە بەردەم پاڵنەری ئایینی و مۆری پێغەمبەرایەتی و مایەپووچبوونی شارستانیەتی جیهانیی و دەرکەوتنی قەیرانە هەزری و مەعریفییە جیهانیی و ناوچەییەکان، قورئانی پیرۆز بە تەنها بەرهەڵستی دەکات و بەرەنگاری دەبێتەوە و ئامادەیە بۆ چوونە نێو جەنگێکی گشتی، بەهۆی ئەوەی کە کتێبی سرووشێکی ڕەهایە و چارەسەری بۆ هەموو ئەم قەیرانانە پێیە، بۆیە بەردەوام دەبێت لە بەخشش و بەخشندەییەکی، دوای ئەوەی ئەوانی دیکە هیچیان پێنەما کە پێشکەشی مرۆڤایەتی بکەن، کەواتە ئەمە جەنگی تاقیکردنەوەیە بۆ ئێمە لەبەردەم ئەندازەی تێگەیشتنمان بۆ پڕۆگرامێتی قورئانی پیرۆز و توانای ئێمە لەسەر چاکسازی و ڕاستکردنەوەی ڕێبازی شارستانیەتی پێی و دەرهێنانی پڕۆگرامە جیاوازەکانی زانستەکان لەو قەیرانانەی کە تێیکەوتوون لە ڕێگەی (کۆکردنەوە لە نێوان دوو خوێندنەوەکە)دا.

زانستە سەردەمییەکان گەیشتوونەتە قۆناغی زۆر پێشکەوتوو لە زانین و هەستکردن بە دیاردەکان، چونکە دەبێت ئەوە بزانین کە ئەو دیاردانە بەو شێوەیە نەماون کە زۆربەی زانایانی پێشوو لێی حاڵی بووبوون، یان دیاردەکانی جیهانی پێشوو وەك جاران بەدیناکرێن، ئەو

دیاردانەی کە جاران بەرجەستە بوون، لەبەردەم چاوەکان شێوەکانیان وەك جاران نەماون و وەك جاران نابینێرن، چونکە ئەو هەستانەی کە جاران هۆکاری تێگەیشتن و بینین بوون، ڕێگەیان خۆشکرد بۆ هاتنی هەستی گەردبینی و میکرۆسکۆب و ئەلیکترۆنی، کە وای کردووە مانا و تێگەیشتنی تازە بۆ ئەو دیاردانە بێنێتە کایەوە، بۆ نموونە: ئەگەر زانایانی پێشوو وا تێگەیشتبن کە گەردیلە (ذرة) بریتیە لە دەنکە لم، یان خۆڵێك کە بە چاو دەبینرێت، ئەوە ئەمڕۆ گەردیلە (ذرة) بە هۆی ئامێری وردبینەوە مانایەکەی گۆڕاوە، لە شتێك کە جاران بە چاو دەبینرا، بۆ شتێك کە بە چاو نابینرێت، خوای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرموویێت: **{فَلاَ أُقْسِمُ بِمَا تُبْصِرُونَ (٣٨) ومَا لاَ تُبْصِرُونَ}**. (الحاقه: ٣٧ـ٣٩). مانای: سوێند بەو شتانەی کە دەیانبینن، بە ئەو شتانەش کە نایانبینن.

پاشان هەر ئەو گەردیلەیە (ذرة) جارێکی دیکە مانایەکەی گۆڕا و بوو بە تەقینەوەو بوو بە وزە، لێرەدا تێدەگەین لە وردیی قورئانی پیرۆز و داناییەکەی لە فەرمایشتەکەیدا کە دەفەرمووێ: **{يَا بُنَيَّ إِنَّهَا إِنْ تَكُ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ فَتَكُنْ فِي صَخْرَةٍ أَوْ فِي السَّمَاوَاتِ أَوْ فِي الأَرْضِ يَأْتِ بِهَا اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ}**. (لقمان: ١٦)

مانای: لەسەر زمانی لوقمان دەفەرموویێت: ئەی کوڕی ئازیزم: بەڕاستی ئەگەر گوناهێك بە قەدەر زەڕەیەك بێت (کە زۆر وردە) و لەنێو بەردێکدا لە ئاسمانەکان، یان لە زەویدا حەشار درابێت (لای خوا

شاراوە نییە) و دەیهێنێتە مەیدان، چونکە بەڕاستی خوا هیچ شتێکی لێ شاراوە نییە و زۆریش ئاگادارە.

هـــەروەها کاتێــك زانایــانی پێــشوو لــە (قۆناغــەکانی مێــژوو) تێگەیشتبوون بەوەی کە بریتیین لە بابەت و ڕووداوە یەك لە دوای یـەك و دووبارەکان، ئەو تێگەیشتنەشیان لەسـەر بنـەمای بەدوایەکدا هـاتنی شـەو و رۆژ بـۆ دروسـتبووبوو، ئـەوا ئـەو تێگەیـشتنە زۆر گۆڕانکـاری بەسەردا هاتووە، ئەمڕۆ ئەم قۆناغانـە وا پێناسـە دەکـرێن کـە بـریتیین لەگۆڕانکارییـــە چـــۆنێتیەکان، نـــەك تـــەنها گۆڕانکارییـــە چـــەندییە دامـەزراوەکان لەسـەر بنـەمای ڕۆژ و مـانگ و سـاڵەکان، ئەمەیـە کـە مەبەسـت لــە هۆکـارێتی زانـستی (الـسببية العلميــة) سـەردەم ڕوون دەکاتــەوە، کــە بــە پلــەی یەکــەم لەســەر گۆڕانکارییــە چـۆنێتییەکان (کیفية)، نەك چەندێتییەکان، دامەزراوە.

## پڕۆگرامێتی قورئانی پیرۆز و چارەنووسی مرۆڤایەتی

کەواتە بابەتی (پڕۆگرامێتی قورئانی پیرۆز) تەنها زەرورەتێـك، یـان پێویستییەکی فەلسەفیی ڕووت نییـە، چـونکە لـە کاتێکدا کـە قورئـان بابەتی (کۆکردنەوەی هەردوو خوێندنەوەکە) پێشکەش دەکات، بەڵگە و ڕێنماییەکانی پێویستیش بۆ ڕزگارکردنی هـزری مرۆڤایـەتی لـە قـەیرانی ئایینگەرایی (لاهوت) پێـشکەش دەکـات کـە ڕفێنـەر و داخـەری عـەقڵی مرۆڤـە و هۆکـاری فەرامۆشـکردنی سرووشتیـشە، ـ لەهەمانکاتیـشدا ـ

هەموو ئەو شتانە لە چوارچێوەی بەرنامە و پڕۆگرامی دانراوی خۆی دەردەهێنێت کە زانست لە دروستکەرەکەی جودا دەکاتەوە، بۆیە هەریەك لە دوو پڕۆگرامەکە شوێنەواری خۆیان لەسەر ژیانی مرۆڤ و ڕێڕەوە شارستانییەکەی و بنەما تەشریعییەکانی هەیە، چونکە پڕۆگرامێتی قورئانی پیرۆز ـ کاتێك کە بە چاکی لێی ورد دەبینەوە ـ بە گرنگترین پێشەکی بۆ جێگرەوەیەکی شارستانی جیهانی دەژمێردرێت کە ئامانجی باشکردنی حاڵ و دۆخی موسوڵمانان بە تەنها، نییە، بەڵکو ئامانجی باشکردنی حاڵ و دۆخی هەموو جیهانە، ئەمەش کارێکە پێویستی بە زۆرێك لە توێژینەوەی تایبەت و باش لەسەر خودی قورئانی پیرۆز، بە تێگەیشتنێکی شیکارییانەی باش و بە دیدێکی زانستییانە و جیهانییانە و مەنهەجییانە هەیە.

ئەمەیە مەبەستی سەرەکی لە (پڕۆگرامێتی قورئان) کە قورئانی پیرۆز بکرێتە کتێبی ڕێنمایی و ڕێنیشاندەری جێنشینبوون و ڕێگەی ڕزگاربوون و دەروازەی دەستپێکردنی ئاوەدانکرنەوە، چونکە لە ڕاستیدا، بەبێ تێگەیشتی قورئانی پیرۆز بە تێگەیشتنێکی مەنهەجیی لە چوارچێوەی یەکپارچەییەکەیی و بینا تەواوەکەیدا و بە بێ تێگەیشتنێکی وا کە لەسەر تێگەیشتنی مەنهەجیی سەردەمیانەمان بۆ دیاردە گەردوونییەکان و یاسا و جوڵانەوەکانیدا ڕەنگبداتەوە، دامەزراندنی ئاوەدانکردنەوەیەکی سەلامەت، ئەستەمە، چونکە پڕۆگرامێتی جیهانی سەردەم دەتوانێت شتە زۆرەکان بگەڕێنێتەوە بۆ

یـەك شـت و دیاردەیـەك شـی بکاتـەوە بـە توێژینـەوە و گـەڕان لـەو پەیوەندی و یاسایانەی کە لە ناویدایە و لـە پـشتیەوە هەیـە، تـەنها بـە ڕاڤەکردنێکی سادە و دەرەکی ڕاناوەستێت.

قورئانی پیرۆزی گەورە و پـارێزراو، بـەهۆی یـەکێتی و یەکپارچـەیی بینایەکەیەوە، گونجاوە بۆ ئەم تێگەیشتنە پرۆگرامیـە، بۆیـە پێویـستە قورئانی پیرۆز بەو شێوە و پرۆگرامە بخوێنینەوە کە زانایانی گەردوون، گەردوونی گەورەی پێ دەخوێننـەوە، وەکـو باسمـانکرد، بـە عـەقڵێکی زانستییانەی جیهانیی، بە توانای کاریگەری وا بیخوێنینەوە کە بتوانێت ئەو تێکەڵاویە مەنهەجییەی لـە نێـوان (مەنهەجیـەتی قورئـانی پـیرۆز)و (یاسا و پرۆگرامەکانی گەردوون) تێبگات و کاریان لەسەر بکات.

گومان لەوەدا نییە قەیرانێك هەیە پێویستە جیهان لێ تێپـەڕببێت و بەسەریدا زاڵبێت، ئەم قەیرانەش ئاشکرایە لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە عـەقڵی زانـستیی جیهـانی ئـەم سـەردەمە هـەموو کتێبـە ئایینیـەکان ڕەدەکاتەوە، ئەگەر چاو پۆشـیش بکـات لـە هەنـدێك لـە بابەتـەکانیان، ئەوە هـەر سـوورە لەسـەر ڕەدکردنـەوەی مەنهـەجی هەریەکـەیان و لـە یـەکێتی و یەکپارچـەیی بینـای هەریەکـەیان و لـە مەبەستەکانیـشیان تێناگات و ئەوە دووپاتدەکاتەوە کە تایبەتمەندی هەریەکێك لـەو کتێبـە ئایینیانـە پێوسـتە ڕابووەسـتێت لـە ئاسـتی قەناعەتـە ئیمانییـەکان و پەنهانیەکانی پشتی سرووشتەوە.

کەواتە (کۆکردنەوە لە نێوان هەردوو خوێندنەوەکە) وا دەردەکەوێت لــە دیـدی ئەوانـدا شـتێکی ئەسـتەمە، چـونکە تـا لـەنێو ئــەو کتێبــە ئاییینیانەدا بابەتی وا هەبێت پەیوەندی بە پەنهانـەوە (الغیـب) هـەبێت، ئەوا ئەوان ناتوانن بیخەنە نێو تاقیگەکانیانەوە و تاقیکردنەوەی لەسـەر ئــەنجام بـدەن، بۆیــە هــیچ ڕێگەیــەك نییــە بـۆ ئــەوەی بیانکــەن بــە سەرچاوەیەك لەسەر چاوەکانی زانسـت، چـونکە پێیانوایـە بـەم شـتانە زانـست بـەدرۆ دەکەوێتــەوە و بیردۆزەکـانی تێکدەشـکێن، هـەموو ئـەو شتانەی کە کتێبــە ئاسمانییــەکان ئامـاژەی بـۆ دەکـەن لـە بوونـەوەرە نەبینراوەکان، یان لە چیرۆکە مێژووییەکان کە ناچنە ژێر تاقیکردنەوەی زانستییە دانراوەکانی سەردەم ـ لە دیدی ئەوانـدا ـ، کەسـیش ناتوانێـت سیفەتی زانستی پێ ببەخشێت، بۆیە یونـسکۆ پێناسـەیەکی تـازەی بـۆ (معرفة) دەرهێنا، پێناسەی کرد بەوەی (مەعریفـە بـە هـەموو زانراوێـك دەوترێت کە ملکەچ بێت بۆ هەستەکان، یان بۆ تاقیکردنەوە).

ئەم جۆرە بۆچوونە لە تێگەیشتنێکی هەڵەوە سەرچاوەی گرتووە کە تێبــینی (کۆکردنــەوەی هــەردوو خوێندنەوەکــەی) نــەکردووە، چـونکە مەبەست لە (هەردوو خوێندنەوەکە) ئەوەیە کە بگەینە (تێگەیـشتنێکی گەردوونی) بۆ بوون و بوونـەوەران کـە بـە تـەنها پـشت نەبەسـتێت بـە خوێندنــەوەی دووهــەم (گــەردوون)، چـونکە ئەگــەر تــەنها پــشت بــە خوێندنـەوەی دووهـەم ببەسـتین، ئـەوە هـەر لەسـنوور و چوارچـێوەی

دانـــراوی هـــزری مرۆڤایـــەتی و بۆچـــوونەکانی لـــەبارەی بـــوون و بوونەوەرانەوە دەسـووڕێینەوە و بیرکردنەوەیـەك ئـەنجام دەدەیـن کـە پشت بە لێکجوداکردنەوەی دیاردەکە و پارچە پارچەکردنی دەبەستێت بە دەرچوون لە مشتومڕی زانستییانەی سـەردەم و گومـانکردن لێـی و ڕێـژەییبوونی (الجدليـة العلميـة المعاصـرة واحتماليتهـا و نـسبيتها) ص: ٨٠، ف: الثانية.

لێرەدا مەترسییەکانی بە تەنها خوێندنەوەی دووهەم دەستپێدەکات، چونکە ئەویش دەمانگەیەنێتە هزرێکی دانـراوی بەشـیی، نـەك هزرێکـی گـەردوونی گـشتگیر، بـەڵام کـە کاتێـك خوێندنـەوەی دووهــەم لەگـەڵ خوێندنەوەی یەکەم کۆدەکەینەوە، ئەوکاتە بەرز دەبینەوە لە هزرێکـی بەشیی (جزئي) یەکلایەنەی سنووردار بۆ بابەتێکی گشتگیری گەردوونی بە هــەموو ئـەو دیـاردە بینـراو و نەبینراوانەشـەوە کـە لەنێویـدا هەیـە، هەموو ڕەدکردنەوەیەك بۆ ئەوەی ناویان لێناوە پەنهانەکان و ئەوەی لە پشت سرووشتەوەیە، بریتییە لـە ڕەدکردنـەوەی خوێندنـەوەی یەکـەم، ئەو خوێندنەوە گەردوونییەیە کە لە نێو ـ سرووشدایە ـ و بە ناوی خوای بە دیهێنەرەوە ئەنجام دەدرێت، چونکە سرووش خوێندنەوە بەشییەکان لـەخۆدەگرێت، خوێدنـەوەی یەکـەم هــەموو پەنهانـەکان (الغيبيـات) و ئەوەی لە پشت سرووشتەوەیە، وەك بەشێکی بنەڕەتیی لە پڕۆگرامییدا

لەبەرچاو دەگرێت، نەك تەنها وەك بابەتی سەلمێندراو كە پێویستە تەنها باوەڕیان پێبهێنرێت، بەڵكو وەكو بەڵگە لەسەر بوونێكی گەردوونی گەورەتر لە دەرەنجامەكانی خوێندنەوەی دووهەم، ئەمەیە ڕاستییە گەردوونیە تەواوەكان بە مرۆڤایەتی دەبەخشێت، چونكە بەدوورزانینی پەنهانەكان و دوورخستنەوەیان بریتیە لە بەدوورزانین و دوورخستنەوەی خوێندنەوەی یەكەم، لە كاتێكدا كە بە ئاشكرا بەڵگەكانی ڕاستیبوونی لەسەر ئاستی بوون و دروستكراوە گەردوونییەكان دەبینین، ئەم بابەتانە داستان و ئەفسانەی هەڵبەستراوی پێشینان نین، وەك هەندێك وا خەیاڵ دەكەن، بەڵكو بابەتی جێگیر و سەلمێندراون بە بەڵگەی تەواوەتی لەسەر بوونیان، ئەگەر ئێمە دەست بە ماناكانیانەوە نەگرین، ئەوە ڕەنگە بمانگەڕێنێتەوە بۆ خوێندنەوەی دووهەمی دانراوی تاكلایەنە، ئەو كاتە ڕێگەمان نابێت بۆ زانینی مێژووی گەردوون لە مانا ڕاستەقینەكەی خۆیدا، كەواتە خوێندنەوەی یەكەم داوامان لێناكات كە تەنها باوەڕ بە بوونی خودا بهێنین، بەڵكو ئاڕاستەمان دەكات بەرەو خودایەتی (الله) و تێگەیشن لە دەسەڵاتی بەسەر دروستكرنی گەردوون و گرێدانی دواڕۆژی مرۆڤایەتی بە دروستكردنی هەموو گەردوونەوە، مانای بە پڕۆگرامی دروستكردنەوە كە پڕۆگرامی بابەتییانەی هەموو ئەو شتانەی

لـەخۆگرتووە کـە بـە پێنـووس فێـری دەبـین، ئـەو کاتـە پرۆگـرامێتی دروستکردن بە (خودای دروستکەرەوە) و پرۆگرامێتی ئەو شتانەی کـە قەڵـەم تێبینیـان دەکـات و دەیاننووسـێتەوە، لـە یـەك خوێندنـەوەی گەردوونیدا کۆدەکەینەوە، ئەو کاتـە چوارچێوە ئیمانییـە گشتگیرەکە دێتەدی. ئەگـەر ئـاواش نەکـەین ئـەو کاتـە پرۆگـرامێتی دەبێتـە چـەند تێنووسـێکی هەڵبـژێردراو بـەپێی حـەزە خودیـەکان ـ بـێ بابەتییانـە ـ و لادەدات بۆ خوێندنەوەی دووهەم بە تەنها.

جیهان بۆ ئەوەی لەو قەیرانە فیکـری و شارسـتانیانەی تێیکـەوتووە دەربچێت، پێویستی بە زانینی ڕەهەندە گەردوونییەکان هەیە ـ بە مانـا پەنهانییەکـەی ـ لـەبارەی پێکهاتـەی بـوون و چارەنووسـیەوە، ئەوەیـە کاری خوێندنەوەی یەکەم کە هەندێك پێیانوایە دەبێت دووربخریتەوە لە بازنەی زانـستییەوە، لەبـەر ئـەوەی خوێندنـەوەی ئـەو سرووشـەیە کـە بەدورریان زانیبوو، پێویـستە لەسـەر ئێمـەش مرۆڤایـەتی زۆر بـەجوانی بـۆلای بگەڕێنینــەوە. بەڕاسـتی کارەکـە گرنگـە، ڕووبەڕووبوونەوەکـە گــەورەو فراوانــە، بــەفراوانی ئــەم گەردوونــە، سەرەتاکەیــشی بــە (کۆکردنەوەی هەردوو خوێندنەوەکە) دەسـتپێدەکات و ئامانجەکەیـشی ڕزگارکردنی مرۆڤایەتییە بۆ ئەوەی خێر و خۆشـی هـەموان بگرێتـەوە و ڕاستی سـەروەر بێـت و هیدایـەت بڵاوبێتـەوە، خـەڵك هـەموو بێنـە نێـو

ئاشتیەوە کـە ڕێگـەی قورئـانی پـیرۆزە و زەوی بـە ڕوونـاکی قورئـان و باوەڕ، ڕۆشن بێتەوە. بەردەوامبوونمان لـە گفتوگـۆی زانـستی بـەمانا و مەبەست و جێبەجێکارییە مەنهەجییەکان وامان لێدەکات بتـوانین ئـەم بەربەستە و گشت بەربەستەکانی بەردەم ڕێگەی قورئانی پیرۆز لاببەین.

مامەڵەکردنی خاوەن تایبەتمەندییـە جیاوازەکـان لەگـەڵ (پرۆگرامـی مــەعریفی قورئــان) وامــان لێــدەکات کــە پــەردە لەســەر لایەنــە جۆراوجۆرەکانی لابدەین و قەناعەت بە زانایـان و توێـژەران بکـەین کـە قورئان چەندە ورد و سەلامەتە و چەندە پێویستە بەکاربخرێت و پشتی پێ ببەسترێت.

**{واللَّهُ غَالِبٌ عَلَى أَمْرِهِ ولَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لاَ يَعْلَمُونَ} (يوسف: ٢١)**

مانای: خوای گەورە زاڵە بەسـەر کـار و فەرمانـەکانی خۆیـدا، بـەڵام زۆربەی خەڵکی بەمە نازانن.

# پاشەکی

لەپاشـان، ئـەوەبوو بابـەتی (کۆکردنـەوەی هـەردوو خوێندنەوەکـە) ئەگەر پێشت خۆشە پێی بڵێ بیردۆز (النظرية)، بابەتێك بوو هەندێك لـە گـەورە زانایانمـان وەك: (الحـارث المحاسـبي، أبـي طالـب المكـي، إمـام الحـرمين، فـارابي، غزالـي، ابـن الحـزم و قاضـي عبـدالجبار الهمـداني) بەکورتی باسیان لێـوەکردووە، هـەروەك هەنـدێك لـە ئاماژەکانیـشی لـە مەوسـوعە ئوسولییەکانیـشدا باسـکراون، چاکـسازییخوازانیش لـە چوارچـێوەی بۆچـوونەکانی لێکنزیککردنـەوە هزرییـەکان (المقاربـات الفكرية) و هزری دەسپێشخەری وەك: شێخ محەممەد عەبدە، محەممـەد ئیقبال و مستەفا سەبری و.. هتد، بانگەشەیان بۆ کردووە، بەڵام پشکی شایستەیان بەرنەکەوتووە بۆ ئەوەی گفتوگۆ و ئـاڵوگۆری زانـستییانەی لەنێو زانایاندا لەبارەوە بکرێت بۆ ئـەوەی بەتـەواوی پێبگـات و لەسـەر پێی خۆی ڕابووەستێت و لایەنەکانی ڕوون ببنەوە.

ئەوەی کە بە (ئیعجازی زانستی) ناسراوە، ڕێگرییەکانی زیـاترکردن لەنێوان عەقڵی موسوڵمان و دەرخستنی وەك پرۆگرام، یـان دیاریکـەری

پڕۆگرامی، بەڕاستی بینیم کەلێنـەکان لـە نێـوان کۆکردنـەوەی هـەردوو خوێندنەوەکە و ئیعجازی زانستی، زۆر گەورەن.

لەڕاستیدا لـە دیـارترین و گـرنگترین زانایـانی سـەردەممان کـە ئـەم بابەتەی باس کـردووە، برامـان (محمـد أبوالقاسـم حـاج حمـد)ەیـە، کـە هزرسازێکی سودانییە (خودا ڕەحمی پێ بکات) کە لـە چوارچـێوەیەکی فەلسەفی بەتامدا پێشکەشی کردووە، ئێمـەش ئـەمڕۆ بـەم پۆشـاکەیەوە پێشکەشی ئوممەتی قورئانی دەکـەین، بـە شـوێنکەوتنی هـەنگاوەکانی پـێش خۆمـان. ئومێـدێکی زۆرمـان هەیـە توانیبێتمـان گرنگـی ئـەم بابەتـەمان لـە خولگـەی (پڕۆگـرامێتی قورئـانی)دا ا(لمنهجیـة القرأنیـة) ڕوونکردبێتەوە و دەرمانخستبێت کە چەندە بابـەتێکی گـەورەو گرنگـی مەترسیدارە.

ئەم باباتە ـ لەگەڵ ئەو هەوڵەی کە تێیدا خەرجمان کردووە لای خودا حیـسابی دەکـەین ـ بابـەتێکی کـورت و کەمـە و مەبەسـتمان ئاگادارکردنەوەی توێژەران بوو ـ لە هەموو تایبەتمەندییە جیاوازەکـان ـ لەم بابەتە مەعریفییە گرنگـە، بـۆ ئـەوەی لێهاتووەکانیـان هەریەکـەیان بـەپێی تایبەتمەندییـەی خـۆی لـە هـەموو بابەتـە جیـاوازە فراوانـەکانی بکۆڵنەوە، ئەو کاتە ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی ئەم بابەتە بڵاوببێتەوە و یارمـەتی توێـژەرەکان دەدات کـە وەك دیاریکـەرێکی مەنهـەجیی پێـشکەشی بکـەن، دواتـر ئەمـە یارمـەتی ڕووناککردنـەوە و پێگەیانـدن

دەدات بۆ چارەسەرکردنی زۆرێك لـە گرفتـەکان لـە بـوارە جیاجیاکـانی مەعریفـە: لــە بـواری فەلـسەفەی زانـستە سرووشـتیەکان و خوێندنــە ئاینیەکان ـ ئەگەر ئەم دەربڕینە دروست بێت ـ لەگەڵ زانست و زانیاریە مرۆڤایەتی و کۆمەڵایەتییەکان و هەندێك بابەتی هزریی دیکە، بۆیە ئێمە هــانی توێــژەرە لێهاتووەکــان دەدەیــن کاربکــەن بــۆ پێگەیانــدن و دەوڵەمەنـدکردنی ئـەم بابەتـە گرنگـە، بـۆ ئـەوەی لەسـەر پێـی خـۆی ڕابووەستێ (إن شاء الله تعالى) ئەگەر پاش ماوەیەکیش بێت.

خوای گەورەش یارمەتیدەر و سەرخەرە.

# ليستى سەرچاوەكان

- ابـن الأثـير، المبـارك بـن محمـد الـشيباني: جـامع الأصـول في أحاديـث الرسول، التحقيق محمود الأرناؤوط، رياض عبدالحميد مراد، محمد أديب الجـادر، إشراف: عبدالقادر الأرناؤوط، بيروت، دار ابن الأثير (١٤١٢هـ،١٩٩١م).

- الإصلاحي، محمد اجمل محمد ايوب: مفردات القرأن للفراهي واهميتـه في علم غريب القرأن، المدينة المنورة، مجمع الملـك فهـد لطباعـة المـصحف الـشريف (١٤٢١هـ، ٢٠٠٠م).

- إقبال، محمد: تجديد الفقـه الـديني في الإسـلام، التحقيـق عبـاس محمـود العقاد، مهدي علام (ط٢) القاهرة، لجنة التأليف و الترجمة و النشر (١٩٦٨م).

- الآلوسي، محمود شكري: روح المعاني في تفـسير القـرأن العظـيم والـسبع المثــاني، تــصحيح علــي عبــدالباري عطيــة، بــيروت، دار الكتــب العلميــة (١٤١٥هـ/١٩٩٤م).

- إمام الحرمين، عبدالملك بن عبدالله بـن يوسـف الغيـاثي: غيـاث الأمـم في التيات الظلم (ط٢)، (د. ن) (١٤٠١هـ/١٩٨١م).

- البخـاري، محمـد بـن إسماعيـل بـن ابـراهيم: صـحيح البخـاري، تحقيـق المـصطفى ديـب (ط٣) دمـشق، بـيروت، دار ابـن الكـثير، دار اليمامـة (١٤٠٧هـ، ١٩٨٧).

- البغوي، الحسين بن مسعود بن محمد: التفسير البغـوي، معـالم التنزيـل، تحقيق محمد عبدالله النمر، عثمان جمعة ضميرية، سليمان مـسلم الحـرش (ط٤)، الرياض، دار طيبة (١٤١٧هـ/١٩٩٧م).

- البقاعي، برهان الدين ابراهيم بن عمر بن حسن: نطم الدرر في بيان تناسب الآيات والسور، تحقيق عبدالرازق غالب المهدي، بيروت، دار الكتب العلمية (١٤١٥هـ/١٩٩٥م).
- البيهقي، أحمد بن الحسين بن علي: أحكام القرأن للشافعي، جمع محمد بن زاهد الكوثري، تحقيق عبدالغني عبدالخالق، بيروت، دار الكتبة العلمية (١٤٠٠هـ/١٩٨٠م).
- الترمذي، محمد بن عيسى بن سورة: سنن الترمذي، وهو الجامع الصحيح، تحقيق عبدالوهاب عبدالطيف، عبدالرحمن محمد عثمان (ط٢) بيروت، دار الفكر (١٤٠٣هـ، ١٩٨٣م).
- ابن الجوزي، عبدالرحمن بن علي بن محمد: زاد المسير في علم التفسير، تحقيق احمد شمس الدين، بيروت، دار الكتب العلمية (١٤١٤هـ/١٩٩٤م).
- حاج حمد، محمد أبو القاسم: العالمية الإسلامية الثانية: جدلية الغيب والإنسان والطبيعة، بيروت، دار ابن حزم (١٤١٦هـ/١٩٩٦م).
- الحارث المحاسبي، الحارث بن أسد: الرعاية لحقوق الله، تحقيق عبدالحليم محمود، القاهرة، دار المعارف (١٩٩٠م). ابن حزم، علي بن أحمد بن سعيد: المحلى، القاهرة: دار الآفاق الجديدة، (د. ت).
- ابن حنبل، أحمد بن محمد بن هلال: المسند، تحقيق أحمد بن محمد بن شاكر، القاهرة، دار الحديث (١٤١٦هـ/١٩٨٣م).
- الخطيب، محمد عجاج: السنة قبل التدوين، (ط٤) القاهرة، مكتبة وهبة، (١٤٢٥هـ/٢٠٠٤م).
- ابن خلاد، الحسن بن عبدالرحمن الرامهرمزي: أمثال الحديث، تحقيق عبدالعلي عبدالحميد، بومباي، الدار السلفية (١٤٠٤هـ/ ١٩٨٣م).

- ابن خلدون، عبدالرحمن بن محمد بن محمد: المقدمة، تحقيق علي عبدالواحد وافي، القاهرة، دار نهضة، مصر (٢٠٠٤م).
- الخولي، أمين التفسير، نشئته، تدرجه، تطوره، بيروت، دار الكتاب اللبناني (١٩٨٥م).
- الدارمي، عبدالله بن عبدالرحمن بن الفضل: سنن الدارمي، تحقيق: فواز أحمد زمرلي، خالد السبع العلمي، (ط٢)، بيروت، دار الكتاب العربي (١٤١٧هـ/ ١٩٩٧م).
- دروزة، محمد عزة: تأريخ بني إسرائيل من أسفارهم وأحوال وأخلاق ومواقف اليهود و في عصر النبي (صلى الل) وبيئته من القرأن الكريم، بيروت، المكتبة العصرية (١٤٨٩هـ/١٩٦٩م).
- دروزة، محمد عزة،: القرأن والمبشرون (ط٣)، بيروت، دمشق، المكتب الإسلامي (١٣٩٩هـ/ ١٩٧٩م).
- الذهبي، محمد حسين: الإسرائيليات في التفسير والحديث (ط٣) القاهرة، مكتبة وهبة (١٤٠٦هـ/ ١٩٨٦م).
- الرازي، محمد بن أبي بكر بن عبدالقادر: تفسير الرازي، تحقيق محمد رضوان الداية، بيروت دار الفكر المعاصر (١٤١١هـ/١٩٩٠م).
- الرازي، محمد بن عمر بن الحسين: المحصول في علم أصول الفقه، تحقيق طه جابر العلواني، الرياض، جامعة محمد بن سعود (١٤٠١هـ/١٩٨١م).
- الرازي، محمد بن عمر بن الحسين: مفاتيح الغيب، القاهرة المطبعة العامرة الشرفية (١٣٢٤هـ).
- الزركشي، محمد بن بهادر بن عبدالله: البرهان في علوم القرأن، تحقيق محمد أبوالفضل إبراهيم (ط٢) منقحة، بيروت، دار المعرفة (١٣٩١هـ/١٩٨٨م).

- الشافعي، محمد بن إدريس بن العباس: الرسالة تحقيق وشرح: أحمد محمد شاكر، القاهرة، مطبعة البابي الحلبي (١٣٠٩هـ).
- صبري، مصطفى: موقف العقل والعلم والعالم من رب العالمين وعباده المرسلين، بيروت، دار إحياء التراث العربي (١٤١٣هـ/١٩٩٢م).
- الطباطبائي، سيد محمد حسين: الميزان في تفسير القرأن، قم، جماعة المدرسين في الحوزة العلمية (١٤١٧ه).
- الطبري، محمد بن جرير بن يزيد: تفسير الطبري، تحقيق بشار عواد معروف، عصام فارس الحرستاني، بيروت، مؤسسة الرسالة، (١٤١٥هـ/١٩٩٤م).
- الطوسي، محمد بن الحسن بن علي، التبيان في تفسير القرأن تقديم آغا بزرك الطهراني، بيروت، دار إحياء التراث العربي (د. ط).
- الطياليسي، سليمان بن داود بن الجارود: مسند أبي داود، الطياليسي، تحقيق: محمد بن عبد المحسن التركين، القاهرة، هجر (١٤٢٠هـ/١٩٩٩م).
- ابن عاشور الطاهر، محمد طاهر ابن حمد بن عبد القادر: تفسير التحرير والتنوير، تونس، الدار التونسية للنشر (١٩٨٤م) (٣٠ج).
- عبد الخالق، عبد الغني: حجية السنة، بيروت: دار القرأن الكريم (١٤٠٧هـ/١٩٨٦م).
- ابن العربي، محمد بن علي بن محمد: أحكام القرأن، تحقيق: محمد عبد القادر عطا، بيروت، دار الكتب العلمية (١٤١٦هـ/ ١٩٩٦م).
- العلواني، طه جابر: اشكالية الردة، القاهرة، دار الشروق الدولية، (د. ت).
- العلواني، رقية طه جابر: أثر العرف في فهم النصوص قضايا المرأة أنموذجاً، دمشق، دار الفكر (١٤٢٤هـ/ ٢٠٠٣م).

- الغزالي، محمد بن محمد بن محمد: إحياء علوم الدين، دمشق، دار قتيبة (١٤١٢هـ/١٩٩٢م).
- الفارابي، محمد بن محمد بن طرفان: التنبيه على سبيل السعادة، تحقيق: جعفر آل ياسين آل سعود، بيروت، دار المناهل (١٤٠٧هـ/١٩٨٧م).
- الفراهي، عبد الحميد: إمعان في أقسام القرأن، دمشق، دار القلم (١٤١٥هـ/١٩٩٤م).
- فياض، محمد جابر: الأمثال في القرأن الكريم، بغداد، دار شؤون الثقافية العامة (١٩٨٨م).
- ابن قيم الجوزية: إعلام الموقعين عن رب العلمين، تحقيق: محمد المعتصم بالله البغدادي، بيروت دار الكتب العربي (١٤١٦هـ/١٩٩٦م).
- ابن القيم الجوزية بدائع الفوائد، محمد منير الدمشقي، بيروت، دار الكتاب العربي (د. ت).
- ابن كثير، اسماعيل بن عمر البصري، تفسير القرأن العظيم، تحقيق: سامي ابن محمد السلامة (ط٢) الرياض، دار طيبة (١٤٢٠هـ/١٩٩٩م).
- ابن كثير، اسماعيل بن عمر البصري: فضائل القرأن، تحقيق: حجازي بن محمد بن شريف، القاهرة، مكتبة ابن تيمية (١٤١٦هـ/١٩٩٥م).
- الماوردي، علي بن محمد بن حبيب: الأحكام السلطانية والولايات الدينية، تحقيق: عصام فارس الحرستاني، محمد ابراهيم الزغلي، بيروت، المكتب الإسلامي(١٤١٦هـ/١٩٩٦م).
- محمد عبده بن حسن خير لله: الأعمال الكاملة للإمام محمد عبده، تقديم محمد عمارة، بيروت، المؤسسة العربية (١٩٨٠م).

- مسلم بن الحجاج بن مسلم: صحيح مسلم بشرح النووي تحقيق محمد فؤاد عبدالباقي، بيروت دار الكتب العلمية (١٤١٥ه/١٩٩٥م).
- ناصف، مصطفى: مسؤولية التأويل، القاهرة، دار السلام للطباعة والنشر و التوزيع (١٤٢٥ه/٢٠٠٤م).
- نعناعة، رمزي: بدع التفاسير في الماضي والحاضر، الرياض مؤسسة الأنوار (١٣٩٠هـ/١٩٧٠م).
- الهيثمي، علي بن ابي بكر بن سليمان: مجمع الزوائد ومنبع الفوائد، التحقيق حسين سليم اسد الداراني، دمشق، دار المامون للتراث (١٤١٢هـ/١٩٩٢م).
- ابن الوزير، محمد بن ابراهيم بن علي: ترجيح اساليب القرأن على اساليب اليونان، بيوت، دار الكتب العلمية (١٤٠٤هـ/١٩٨٤م).